# چەند وێنەیەک لە ژیانی تابعین

ئامادە و کۆکردنەوەی

عبداللّٰە خاکی



التابعين



بسم الله الرحمن الرحيم

# ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتوك: " چەند وێنەیەك لە ژیانی تابعین"

نووسینی: " عبد الرحمن رأفت پاشا "

وەرگێڕانی: " باوکی زوبێر"

ئامادە و کۆکردنەوەی: " عبدالله خاکی "

دیزانینی ناوەوە: " عبدالله خاکی "

دیزاینی بەرگ: " باوکی عبدالرحمن"

# پێشەکی

الحمدلله‌رب العالمين الصلاة والسلام على قائد المرسلين محمد (ﷺ) و على اله و أصحابه و من تبعه بإحسان إلى يوم الدين.
اللهم أرِنا الحقّ حقًّا وارزقنا اتباعه, وأرِنا الباطل باطلاً وارزقنا اجتنابه.
أمابعد:
برایان و خوشکانی بەرێزم ئەم نامیلکەی لەبەردەستانە چەن وێنەیەک لە ژیانی ئەو(تابیعیە) بەرێزانەدا کە ناسراون بە پیشینە چاکەکانی ئومەت باس ئەکەین بۆ ئەوەی پەندو عیبرەت وەربگرین وەکەمێ پشوو بدەین لە چەرمەسەریی ئەم ژیانە تاویک یادی خوای پەروەردگارمان بهێنێتەوە یاد، وە بەراستی زانین و شارەزابوونی ژیانی ئەم بە ریزانە زیاتر لە خواترسان و بەکەم زانینی ئەم دونیایەمان پێ ئەگات و هانمان ئەدەن بۆ تێکۆشان و کۆشکردن بۆ دوارۆژی نەبڕاوەی بەهەشت، کە بەڕاستی ئەمانە چۆن ژیانی دونیایان خستە ناودەستیان نەوک بیخەنە ناو دڵیان بۆیە دونیا زۆر لایان بێ نرخ بوو، وە خوا پەرستی ئەم (تابیعیە) بەرێزانە هاوەڵە بەرێزەکانی پێغەمبەریان (ﷺ) سەرسام کردبوو کەچۆن ئەمانە پێغەمبەریان (ﷺ) نەبینوە وە ئەم هەموو خواپەرستیە ئەکەن، جا بەرێزان فەرموون با بچینە خزمەت ژیانی ئەم کەلە پیاونەی ئیسلام کە چۆن نمونەی پێشەنگ و پێشەوان بۆ موسوڵمانان.
لە کتێبی **(صور من حياة التابعين)** واتە: (چەند وێنەیێک لە ژیانی تابیعیە) بەرێزەکان نووسەری بەرێز: (عبدالرحمن رأفت پاشا) کە

نووسەرێکی عەقیدە پاك و باوەڕ پێکراوە لە بۆیە بەرێز: (باوکی زوبێر) هاستا بوو بە وەرگێرانی بەلام کۆنەکرابوویەوە لە شێوەی نامیلکە، بەلکو بابەت بابەت لە ماڵپەر و سایەت و تۆڕە کۆمەلایەتیە کان بڵاوکرابوویەوە، کاتێك خوێندمەوە گاریگەر بووم پێی بۆیە ساڵی (٢٠١٦) ژیانی گشتیانم کۆکردەوە لە نامیلکەیەك و دووبارە پێدا چوونەوەم بۆ کرد، پێم باشبوو نەفەوتێ و لە نامیلکەیەك گشتیان کۆبکەمەوە تاکو موسوڵمانان سوودی لێ وەرگرن و چاو لەم کەلە پیاوانەی ئیسلام بکەن، دواتر (باوکی زوبێر) (الله تعالی بی پارێزێ) نامەیان بۆ ناردم و خۆی پێناساندم و دەستخۆشی و دوعای خێری بۆ کردم بۆ کۆکردنەوەی ژیانی ئەم کەلە پیاوانە.

داواکارین لە الله تعالی ماندووبوون و شەونخونیمان بۆ بکاتە مایەیی بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خۆی و چوونە بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەت و بەردەوام بوون لەسەر ڕێبازی ئیسلام و پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) و پێشینە چاکەکانی ئومەت امین ...

بەندەی الله تعالی: عبدالله خاکی.

٢٠٢٠/٥/١ هەینی

هەشتی ڕەمەزان

# وێنەی یەکەم
# عەتایی کوڕی ڕەباح

سەلەمەی کوڕی کوهەیل دەفەرمووێت: هیچ کەسێکم نەبینوە زیاتر زانیاری لەبەر خوای گەورە وەربگرن جگە لەم سێ کەسانە (عەتا - وە تاوس - موجاهید.

ئێمە ئێستا لە دەی کۆتایی مانگی زوالحیجەین سالی نەوەد و حەفتی کۆچین، وە مالی اللە زمەی دێت بە حاجیان لە هەموو شوێنێکەوە بە سواری ئەسپەوە، وە بە گەنج و پیاوی پیرو ژن و پیاو، ڕەش و سپی و عەرەب و عەجەم و سەرۆک و خەڵک و هەمووی بوونەتە میوانی ماڵی اللە تعالی، میوانی اللەی هەموو جیهانیان بە دڵێکی جۆش و خرۆشەوە وە ئەوەتا خەلیفە (سولەیمان کوڕی عبدالملک) کار بەدەستی خەڵکی هاتووە وەک ئەم خەڵکە سەر کۆت و پێ خاوس وەک ئەم خەڵکە ئەسورێتەوە وە لە دوای ئەوەوە دوو کوڕەکەی بوون، زۆر جوان و قەشەنگ بوون وە کاتیک خەلیفە لە سوران بەچوار دەوری ( کەعبە) سورایەوە تەواو بوو ئاماژەی بە یەکیک لەدار دەستەکانی دا گووتی: ئەمە برادەرەکەتان لە کویە ؟

گوتیان: گەورەم ئەوەتا وا نوێژ ئەکات لەلای ڕۆژئاوای (مزگە وتی حەرام) وەخەلیفە چوە لای ئەم شوێنەی کە ئاماژەی بۆ کرا، وە لە پشتیەوە دوو

کوڕەکەیەتی وە داردەستەکانی ویستیان ڕێگای بۆ خۆش بکەن بۆ ئەوەی بە خۆشی بچێتە پێشەوە بەلام ئەو گوتی:
(واز بهێنن منیش وەک ئەم خەڵکە وام کەس گەورەتر نیە لە کەس تەنها بە لە الله ترسان نەبێت) وە لەوانیە کەسێکی هەژار کورتەک لە ڕەنگێ و شەروال لەڕەنگێ بەلام لە الله ترس، خوای گەورە لێی وەر بگرێت لە ئێمە وەرنەگرێت، دوایی چوو بۆ لای کابراکە هێشتا لە ناو نوێژدا بوو خەریکی کرنۆش بردن بوو وە خەڵکیش لە دوایەوە دانیشتبوون و لەم لاو لای خەلیفە چووە شوێنێک دانیشت لە گەل دوو کوڕەکەی، دوو کوڕەکەی زۆر بە وردی تەماشایان ئەکرد، کە کابراکە نوێژەکەی تەواو کرد تەماشایانی کرد پیاوێکی (ڕەش پێست) ی لووت گەورە ئەگەر دانیشتبا وەک قەل وا بوو، دوایی کابرا بەلای چاوی تەماشای لای خەلیفەی کرد خەلیفە سەلامی کرد، ئەویش ولامی دایەوە دوایی خەلیفە پرسیار گەلێکی کرد لە بارەی حەجەوە ئەویش هەمووی وەڵام دایەوە هەر وەڵامێکی بە ئایەتێک یان فەرمودەیەکی پێغەمبەری ئازیز ﷺ بوو، وا بە تێر و تەسەلی وەڵامی ئەدایەوە خەلیفەی سەرسام کردبوو دوایی خەلیفە، گوتی: خوای گەورە پاداشتی خێرت بداتەوە.
وە بە خۆی و دوو کوڕەکەی ڕۆیشتن بۆ لای سەفا و مەروا گەنجێک هاواری کرد ئەم ساڵ کەس فتوا نەدات لە حەج جگە لە (عەتایی کوڕی ڕەباح) نەبێت، ئەگەر ئەو لێرە نەبوو (عبدالله کوڕی نەجیح) دوو کوڕەکەی خەلیفە گوتیان: باوکە گیان چۆن کەسێک کە لە ژێر دەستی

خەلیفە دابێت، وە بلێت نابێت کەس فتوا بدات جگە لەم دووانە نەبێت؟ وە کاتێک تۆ پرسیارت لە (عەتا) کرد ئەوها بەم شێوە وەڵامی دایەوە، تۆ گەورەی هەموو موسوڵمانانی، خەلیفەش گوتی: کوڕەکانم ئەوەی کەبینیتان وە چۆن زەلیل و زەبون بووین لە ژێر دەستیا ئەوا (عەتایی کوری رەباحە) ئەو کەسەی کە زانستی لە (عبداللە کوری عەباس) هاوەڵی بەرێزی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) وەرگرتبوو.

دوایی گوتی: (کوڕەکانم فێرە زانست بن چونکە بە زانست خەڵکی بێ قیمەت بەقیمەت ئەبێت وەبەندە ئەبن بە پادشا)، سولەیمانی کوڕی عبدالملک هەلەی نەکرد لەم قسانەی چونکە عەتا خاوەن ئەم زانستە گەورەیە بوو، و عەتا بەندەی یەکێک لە ئافرەتەکان بوو لە (مەککە) بۆیە هەر لەمنداڵیەوە دەستی کرد بە گەران بە دوای زانست بۆیە ژیانی خۆی کردبووە سێ بەش.

**بەشی یەکەم:** بۆ گەورەکەی خزمەتی ئەکرد.

**بەشی دووەم:** بۆ خوای پەروەردگار جوانترین عیبادەتی ئەکرد

**بەشی سێیەم:** فێربوونی زانست بوو لەسەر دەستی هاوەڵە بەرێزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بوو لەوانە وەکو: (عبداللەی کوڕی عومەر، عبداللەی کوڕی عەباس، عبداللە کوڕی زوبێر) و چەند هاوەڵێکی بەرێزی تر، بۆیە دڵی پربو لە زانستی شەرعی، بۆیە گەورەکەی کاتێک بینی ئەم گەنجە خۆی فرۆشتوە بەخوای پەروەردگار ئازادی کرد لە بەر خاتری خوای گەورە بۆیە لەم کاتەوە (عەتا) هەلساماڵی خوای کردە جێگای خۆی

تێیدا فێرە زانست ئەبوو، زانستی فێرە خەڵک ئەکرد خواپەرستی تێدا ئەکرد تاوەکو مزگەوت ببوە ماڵی (عەتا) بۆ ماوەی چڵ ساڵ ئەوندە فێرە زانست ببو تاوەکو ساڵێکیان لە کاتی حەج خەڵک پرسیاریان لە هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) (عبداللە کوری عومەر) ئەکرد ئەم هاوەڵە بەڕێزەی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( من سەرم سورماوە لە خەڵکی مەککە ئەم هەموو پرسیارە لەمن ئەکەن وە لەناو ئێوە عەتای کورڕِ رەباح هەیە)

وە (عەتا) ئەم هەموو زانستەی کە هەی بوو وا دەستی نەکەوتبوو تەنها بە دوو شت نەبێت:

**یەکەم:** دەسەڵاتی بەسەر نەفسی خۆی داگرتبوو هیچ رێگایەکی نەهێشتبوویەوە بۆ ئەوەی بەهەوەسی خۆی بلەوەرێ لەوەی کە هیچ سوودی نیە .

**دووەم:** دەسەڵاتی گرتبوو بەسەر کاتی خۆی لە شتی بێ سوود بەفیرۆی نەئەدا چونکە کات زۆر گرنگە .

ئەوەتا (محمد کوڕی سوقە) ئەفەرمووێت: جارێکیان دانیشتبووم لە لای (عەتا) پێ گوتم: گوێ بگرە بە ئامۆژگاریەکت بکەم، فەرمووی: (کوڕِی برام ئەوانەی پێش ئێمە زۆر ڕقیان لەقسەی زیادو بێ سوود بوو، ئەڵێ منیش گوتم: قسەی زیاد چیە؟

گوتی: جگە لە قورئان و سوونەتی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) ئەیان گوت: ئەمە قسەی زیادە بەڵام تێگەیشتنی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) چۆن

گێردراوتەوە چۆن راڤە ئەکرێت یاخوت فەرمان کردن بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە یاخود فێربونی زانستێک کە لە اللە نزیکت بکاتەوە یان ئیش و کارێک کە سوودی هەبێت بۆ دونیا، دوای رووی تێکردم گوتی:
ئایا ئەتوانی باوەڕ نەکەی کە اللە ئەفەرموێت: (دوو فریشتەتان لەگەلە هەموو شتێک ئەنوسن)
(إِذْ يَتَلَقَّى الْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ قَعِيدٌ )[1] واتە: کاتێک دوو فریشتە چاودێرەکەی ئادەمیزاد کە لەلای ڕاست و چەپیەوە دانیشتوون، هەموو گوفتارو کردارێکی تۆمار دەکەن.
(مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌي)[2]واتە: هەر قسەیەکی لە دەم دەر دەچێت خێرا چاودێرێکی ئامادە، تۆماری دەکات.
دوای گوتی: توخوا یەکێک لەئێمە شەرم ناکات پەرتوکی کردەوەکانی پیشان بدرێت هیچ شتێکی لە ئیش و کاری دونیای تێدا نیە و نە کردەوەیەکی بە سوودی رۆژی دوای تێدا نیە .
وە دونیا بە هەموو شێوەیەک ڕووی تێکربوو بەلام ئەو پشتی لە دونیا کردبوو هەموو ژیانی یەک کراسی هەبوو بایی پێنج درهەم بوو، وە خەلیفەکان بانگیان کرد بۆ برادەرایەتی بەڵام ئەو رەتی کردەوە ئەترسا لەوەی کە ژیانی دونیا هەلی بخەڵەتێنێ.

[1] - سورەتی ق ئایەتی ( ١٧ )
[2] - سورەتی ق ئایەتی ( ١٧ )

ئەوەتا (عوسمانی کوڕی عەتای خوراسانی) ئەگێڕێتەوە ئەفەرمووێ: لەگەڵ باوکم بوم بەرەو شاری (دیمەشق) بەرێ ئەکەوتین بۆ لای خەلیفە (عبدالملك کوڕی مەروان) کە نزیک کەوتینەوە لە شار کابرایەکمان بینی لە سەرپشتی گوێ درێژێک بوو، کراسێکی لەبەر بوو ئەلێ منیش پێکەنیم، گوتم: باوکە ئەمە کێیە ئەم کابرایە؟

باوکم فەرمووی: بێ دەنگ بە ئەمە گەورەی زانایانی حیجازە (عەتای کوڕی ڕەباحە) هاتنە خوارەوە لەگەڵ باوکم ئەم لاولای یەکتریان ماچ کرد دوای سواری پشتی گوێ درێژەکە بونەوە، دوای چونە پێش دەرگای خەلیفە باوکی گوتی: ئەگەر لەبەر (عەتا) نەبوایە نەیان ئەهێشت من بچمە ژوورەوە ئەلێت کاتێک چووینە ژووره خەلیفە گوتیە: (عەتا) فەرموو فەرموو تاوەکو لە سەر کورسیەکەی خۆی دای نا وە خەڵکی زۆر نەجیب دانیشتبوون بێ دەنگ بوون ئینجا خەلیفە گوتی: فەرموو ئەی باوکی موحەمەد چیت پێویستە با بۆت جێبەجێ بکەین ؟

ئەویش فەرمووی: ئەی گەورەی باوەرداران: خەڵکی مەککە ماڵی خوای گەورە دراوسی پێغەمبەری ئازیزن (ﷺ) پارەو ماڵ و سەروەتیان بدەرێ و یارمەتیان بدەرێ.

خەلیفە گوتی: بنووسە بۆیان ماڵ و سەروەت و پارە.

دوای گوتی: هیچی ترت ناوێت ئەی باوکی موحەمەد ؟

گوتی: بەڵێ ئەی ئەمیری باوەرداران:

خەڵکی (حیجاز و یەمەن) ئەوان ئەسلی عەرەبن .

خەلیفە گوتی: بنووسە پارە و ماڵ بۆیان، دواى هیچى ترت ناوێت ئەی باوکی موحەمەد ؟
فەرمووی: بەڵێ یارمەتی موجاهیدان بدە ئە وان ئەم ئاینەیان پاراستوە
خەلیفە گوتی: بنووسە پارەو ماڵ بۆیان، دواى هیچى ترت ناوێت ئەی باوکی موحەمەد ؟
گوتی: داوا کارم لە ئەهلی زیمە جوولەکە و گاورەکان ئەوندە کاری گرانیان پێ نەکرێت.
خەلیفە گوتی: بنووسە هیچی تر کاری گرانیان پێ نەکرێت .
خەلیفە گوتی: هیچى ترت ناوێت ئەی باوکی موحەمەد ؟
گوتی: بەڵێ ئەی خەلیفە لە خوای گەورە بترسە، وە بزانە تۆ بە تەنها دروست کرای و بە تەنها ئەمریت وە بە تەنها زیندوو ئەکرێتەوە وە بە تەنها حیسابت لەگەڵ ئەکرێت.
خەلیفە (هشام) کەوتە سەر چۆک و گریا.
دوایی (عەتا) هەلسا ئەلێت: منیش لەگەڵی هەلسام کاتێک گەیشتینە لای دەرگا کابرایەک هات و یەک کیسە پارەی هێنا و گوتی: خەلیفە ئەمەی داوە بەمن (عەتا) گوتی: زۆر دوورە من وەری بگرم ئەوەتا خوای گەورە ئەفەرمویت: هیچ داوای ماڵ و سامانتان لێ ناکەم بەڵکو داوای پاداشت لە خوای گەورە ئەکەم.
ئینجا سوێند بە الله تعالی لای خەلیفەی بەجێ هێشت یەک قوم ئاوی نەخواردەوە.

وە دوای (عەتا) تەمەنی گەیشتە نزیکەی سەد ساڵ هەمووی بەسەر برد بە پەرستن و گوێڕایەڵی الله تعالی و فێربونی زانست و بلاوکردنەوەی زانست نزیکەی (حەفتا) حەجی کرد حەفتا جار لەکێوی عەرەفات داوی لە الله تعالی کرد کە لەگوناهەکانی خۆش بێت.

ئێمەش داوا لە الله تعالی ئەکەین لێمان خۆش بێت وە بەدوایی ڕێگا و مەنهەجی ئەم کەلە پیاوانە بکەوین.

## وێنەی دووەم:
## عامری کوڕی عبد الله تەمیمی

الله پەرستی دونیا نەویست.

عەلقەمەی کوڕی مەرسەد دەفەرمووێت: هەشت کەس دونیایان نە ئەویست یەکێکیان لەوانە(عامر کوڕی عبد الله التمیمی).

ئێمە ئێستا لەساڵی چوارەمی کۆچین وە هاوەڵە بەرێزەکان و تابعیە پیاو چاکەکان بەفەرمانی پێشەوا عومەری کوری خەتاب (الله لێی رازی بێت) (شاری بەسرە) بنیات ئەنێن بۆ ئەوەی بیکەنە بنکەی سەربازی و پێگەی موجاهیدان بۆ هێرش کردنە سەر (فارسەکان) وە بیکەنە لوتکەی بانگەواز بۆ دینی الله تعالی وە خەڵک لە هەموو شوێنێکەوە رووی تێ ئەکات خەڵکانێک لە (مەککەوە) هەندێکی تر لە (یەمەن) لەم کۆچکەرانە کە لە (حیجازە)وە روویان تێکرد گەنجێکی زۆر جوان و قەشەنگ کەناوی (عامری کوڕی عبدالله تەمیمی) یە عامر ئەم گەنجەی کە دەمو و چاوێکی روناکی هەبوو، زۆر دڵ ساف لە الله ترس ئەویش هاتبوو، بۆ ئەوەی بەرگری لەدینی الله تعالی بکات.

تەمەنی  گەنجی خۆی بۆ خزمەتی رێگای ئیسلام پیر بکات، بۆیە کۆچی کردە ئەم شارە وە (بەسرە) لەو کاتەدا دەوڵەمەندترین شار بوو، چونکە ئەم هەموو (دەسکەوت)ی شەری پێ ئەگەیشت لە کاتێک موسوڵمانان هێرشیان ئەکردە سەر (فارسەکەن).

بەلام (عامر) هەرگیز و هەرگیز ڕووی لە دونیا نە ئەکرد، وە لەم سەردەمەدا هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) (ئەبو موسای ئەشعەری) لە (بەسرە)دا سەرکردەی ئەم شارەبوو وە پێشەوای شەربوو، و پێش نوێژیان بوو فێرکەری ئاینەکەیان بوو ئەم گەنجە بەڕێزە شەو و ڕۆژ گەرماو و سەرما شان بەشانی هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر(ﷺ) (ئەبو موسای ئەشعەری) بوو لێ جیاواز نە ئەبوویەوە، بۆیە ئەم گەنجە بەڕێزە لە دەمی ئەم هاوەڵە بەڕێزە هەموو (قورئانی پیرۆزی) لەبەر کرد و چەندین فەرموودەی پێغەمبەری ئازیزی (ﷺ) لێ وەرگرت.

کە ئەم هەموو زانیاریەی لێ وەرگرت ئەم گەنجە بەڕێزە ژیانی خۆی کردبووە سێ بەش:

**بەشی یەکەم:** فێرکردن و تێگەیاندنی خەڵک لە قورئانی پیرۆز لە مزگەوتی شاری (بەسرە).

**بەشی دووەم:** لە خواپەرستی و شەونوێژ و بەڕۆژوو بونی تاوەکو ماندوو ئەبوو .

**بەشی سێیەم:** جەنگ و کوشتار و تێکۆشان لە پێناوی الله تعالى تاوەکو یەک جەنگ نەما ئەم گەنجە بەژداری تێدا نەکات .

بۆیە لەشاری بەسرە ناسرابوو بە (الله پەرستی دونیا نەویست) بۆچی نا ئەوەتا یەکێک لەپیاوانی شاری بەسرە ئەگێڕێتەوە کە جارێکیان لەگەڵ (عامر)دا لە یەکێک لە جەنگەکان بووین کاتێک شەو داهات (عامر) م بینی، چووە ناو چەند دارێکەوە لە لێوار ئاوێکەوە بوو خۆی حەشار دا.

ئەڵێ منیش چووم بەدوای دا بزانم ئەم کابرایە چی ئەکات ئەم خەڵکە پێ ئەڵێن: (اللە پەرستە دونیا نەویستەکە) ئینجا (عامر) کەوتە نوێژکردن و پارانەوە نەم بینوە لە کەسێکی تر وەک ئەو باشتر نوێژ بکات ئەوەندە بە جوانی نوێژی ئەکرد ئینجا کە لەنوێژەکە تەواوبوو دەستی بە پارانەوە کرد یەکێک لە پارانەوکانی ئەوەبوو دەیفەرموو: (خوایە تۆ منت دروستکرد بەفەرمانی خۆت ئینجا منت هاوێشتە ناو ئەم هەموو و تاقیکردنەوە دوای فەرمانم پێ ئەکەی کەخۆم بگرم خوایە چۆن خۆم پێ ئەگیرێ؟ ئەگەر تۆ یارمەتیم نەدەیت ئەی خوای بەدەسەلات؟
خوایە تۆ ئەزانی ئەگەر ئەم دونیایە هەموی موڵکی من بێت دوای داوام لێ بکرێت لەپێناوی تۆببەخشم ئەوا ئەی بەخشم، خوایە من ئەوها تۆم خۆش ویستوە کە هەرچی ناخۆشی و تاقیکردنەوەم بەسەر دێت لای من ئاسانی کردوە وای لێکردوەمە کە رازی بم بە هەموو قەزاو قەدەرێک هەر کاتێک بەسەرم دێت ) ئینجا کابرای خەڵکی بەسرا، گوتی: من خەوم لێ کەوت دوای هەڵسام بینیم هەر ئەپارێتەوە ئینجا نوێژی بەیانی کرد و دەستی بەپارانەوە کرد گوتی: (خوایە وا بەیان هات و خەڵک داوای خێر و بێری تۆ ئەکەن وە پێویستی من ئەوەیە لێم خۆشبیت خوایە پێویستی من و ئەوان جێبەجێ بکە، خوایە من سێ شتم داواکرد لە تۆ دوانیانت داوە بە من بەڵام یەکیان ماوە خوایە سێ یەمیانم پێ بدە بۆ ئەوەی جوانتر بتپەرستم)

ئەلێت ئینجا هەڵسا لەشوێنی خۆی وچاوی هەڵبری منی بینی، گوتی: برای بەسرایەکەم دیارە ئەم شەو بەدوای منەوە بوویت؟

ئەڵێ منیش گوتم: بەڵێ

(عامر) گوتی: برام هەر چیەکت لەمن بینیوە با ئەمانەت بیت وە بیشارەوە خوای گەورە بتپارێزت.

ئەلێت منیش گوتم: بە الله ئەگەر پێم نەلێت ئەم سێ شتە چیە؟ کە داوت لە خوای گەورە کردوە بەهەموو خەڵک ئەلێم.

(عامر) گوتی: بەس توخوا بەکەس مەڵێ، بەڵام کەزانی من پێ دائەگرم گوتی: باشە بەلام بەمەرجێک بەکەس نەڵێ.

کابرای بەسرای گوتی: باشە پەیمان بێت بە کەس نەلێم تاماوم لە ژیان.

(عامر) گوتی: ئەمانە بوون:

**یەکەم:** (عامر) گوتی: من زۆر ئەترسام لە ئافرەت کە تووشی تاقیکردنەوە ببم داوام کرد خوای گەورە خۆشەویستی ئافرەت بباتە دەرەوە لە دڵم کردی ئێستا چ ئافرەتێک ببینم چ دیوارێک .

**دووەم:** داوام کرد لە الله تعالی کە جگە لە الله نەبێ لەکەسی تر نەترسێم ئەمەشی بۆ جێبەجێ کردم ئێستا جگە لە الله نەبێت لە کەسی تر ناترسم نە لە ئاسمان و نە لە زەوی .

**سێیەم:** داوام کرد لە خوای گەورە خەو لە چاوانم نەهێلی بۆ ئەوەی بە شەو و بە ڕۆژ بی پیرستم بەڵام خوای گەورە ئەمەیانی جێبەجێ نەکرد .

کابرای بەسرای ئەڵێ منیش گوتم: کەمێ بەزەییت بەخۆتا بێتەوە تۆ بەشەو خوا ئەپەرستی بەرۆژی باش نیە بۆ خۆت و بەهەشت زۆر بەکەمی بە دەست دێت بەوەی کە تۆ ئەی کەیت و ئاگری دۆزەخ زۆر بەکەمی ئەتوانی خۆتی لێ بپارێزێت بەوەی کە تۆ ئەنجامی ئەدەیت .

(عامر) گوتی: بەخوا من لەرۆژی پەشیمان بونەوە ئەترسم ئەوکات پەشیمان بوونەوە داد نادات سوێند بە الله هەوڵ ئەدەم بۆ خوا پەرستی تا یەک نەفەسم لە ژیان مابێت ئەگەر قورتارم بوو لەئاگر ئەوا بە بەزیی اللهەی بە سۆزە و ئەگەر قورتارم نەبوو ئەوا بەکەم تەرخەمی خۆمی ئەزانم .

وە ئەم کەلە پیاوە تەنها خواپەرستی شەو نەبوو بەلکو سوارچاکی رۆژ بوو لە جەنگ و جیهادا هەر جەنگ و جیهادێک ڕووی بدایا دژی کافران ئەوا پێشەنگی ئەو جیهادە بوو.

ئەگەر بەرێ بکەوتبایە بۆهەرجیهادێک ئەی گوت: من سێ مەرجم هەیەبۆ برادەرایەتی ئێوە:

**یەکەم:** من ئەبم بە خزمەتکاری ئێوە نابێت کەس خزمەتی ئێوە بکات جگە لەمن.

**دووەم:** نابێت جگە لەمن کەسی تر بانگ ببێژی بێت تەنها خۆم بانگ بدەم .

**سێیەم:** من بەگوێرەی توانا مەسروفی ئێوە ئەکەم .
ئەگەر رازی ببوان ئەوا ئەرۆیشت لەگەڵیان ئەگینا نە ئەرۆیشت، وە ئەم کەلە پیاوە لە هەر شوێنێ ناخۆش بوایە جەنگ گران بوایە (عامر) ت ئەبینی، بەڵام لەگەڵ ئەمەدا خۆی ئەپاراست لە (دەسکەوت) کاتێک لە جەنگ دائەگیرا ئەوەتا پاش جەنگی (قادسیە) کاتێک هاوەڵی بەرێزی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) (سەعدی کوڕی وەقاس) فەرمانی کرد بە (عەمری کوڕی موقرەن) کە دەسکەوتی جەنگ کۆبکاتەوە دەسکەوتێکی زۆریان هێنا لە کاتی جەنگ دەست موسوڵمانان کەوتبوو، لە دەسکەوتەکانی پادشای فارسەکان (کیسرا) ئینجا موسوڵمانان خەریکی کۆکردنەوەی بوون، ئینجا لە کاتی دابەش کردنی دیتیان کابرایەک لەم لاوە هات یەک (مەنجەل)ی زێری پڕ لەدوور و گەوهەری هێنا، دای نا لەبەردەم بەرپرسەکە کابرا لێ پرسی ئەمە چیە؟
گوتی: لەفلانە جەنگدا گروتومە فەرموو: من نامەوێت بیخەرە ناو ماڵی موسوڵمانان، دوایی پێیان گوت: ئەی هیچت بۆخۆت نەبردوە؟ (عامر)فەرمووی: ئەم مەنجەلە کە ئەیبینن لای من زۆربێ نرخە بە اللّٰه هەرچی ماڵ و موڵکی فارسەکان لای من هیچ نرخێکی نیە، وە سوێند بە اللّٰه ئەگەر ماڵی موسوڵمانان نەبوایە ئەوا لەشوێنی خۆی بەرزم نەدەکردەوە، دوای گوتیان: باشە تۆ کێی؟
گوتی: نابە اللّٰه نە بەئێوە ئەلێم سوپاسم بکەن و نە بە خەڵکی تریش ئەلێم بۆ ئەوەی باسم بکەن دوای ڕۆیشت، ئەوانیش کابرایەکیان بە

دوایدا نارد، دوای کابرا کە پرسی پێیان گوت: نای ناسی؟ ئەمە (دونیا نەویستی شاری بەسرایە عامری کوری عبداللّه تەمیمەیە.

بەڵام ژیانی (عامر) هەر وا نەبوو کە زانیتان بەلکو لەسەر گووتنی وشەی (حەق) چەندین جار تووشی ناخۆشی بووە وە دەر بەدەر بووە، بەڵام ئەو هەر بەردەوام بووە لەسەر گوتنی وشەی حەق ئەوەتا جارێکیان لە شاری بەسرا (پۆلیس)ێکی بینی ملّی کابرایەکی ئەهەلی (ذیمە) گرتبوو رای ئەکێشا و کابرا هاواری ئەکرد ئەی کۆمەلی موسوڵمانان فریام کەون بگەنە ئەو کەسەی کە لەژێر پەیمانی اللّه پاشان پێغەمبەرە (ﷺ) ئەی هاوار فریام کەون (عامر) هات گوتی: پارەت داوە؟ گوتی: بەلێ ئینجا رووی لەکابرای پۆلیس کرد، گوتی: چیت لێ ئەوێت؟

گوتی: ئەمەوێت بێت باغ و باغات خاوێن بکاتەوە (عامر) گوتی: ئەم ئیشەت پێ ئەکرێت؟

گوتی: نەخێر چونکە توانام نامێنێت بۆ ئەوەی بژێوی ماڵ و منالّم پەیدا بکەم، ئینجا (عامر) گوتی: بەری بدە کابرای پۆلیس گوتی: بەری نادەم ئینجا (عامر) هاواری کرد ئەی خەڵکینە وەرن فریام بکەون خەڵک لێیان کۆبونەوە کابرای (ذیمە)یان لەژێر دەستی دەرهێنا، ئینجا ئەفسەری پۆلیس کە شکایەتی کرد لای سەرکردەی شاری بەسرە گوتی: (عامر) کابرایەکە دەرچووە لە ژێر فەرمانی ئەمیری باوەرداران وە کابرایەکە (ژن) ناهێنێت و گۆشت ناخوات لەگەڵ پەنیر و نایەتە مەجلیسی گەورە پیاوان لەم تۆمەتانە دایانە پاڵ (عامر) ئەویش گەیاندی بە خەلیفەی

ئیمانداران، عوسمانی کوری عەفان(اللە لێ رازی بێت)، فەرمانی کرد بە سەرکردەی شاری بەسرە کە بانگی (عامر) بکات وە لێکولینەوەی لەگەڵ بکات ئایا ڕاستە یان نا؟

سەرکردەی شاری بەسرە بانگی کرد، گوتی: ئەمیری ئیمان داران پێ ڕاگەیاندوم کە ئەم تۆمەتانەی دراونەتە پاڵ تۆ ئایا ڕاستە یان نا؟

ئەویش گوتی: فەرموو گوتی:

(سەرکردەی موسوڵمان): ئایا راستە تۆ ژن ناهێنیت و ئەتەوێت لابدەیت لە سوننەتی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) ؟

(عامر): نەخێر شایەتی ئەدەم رەبەنیەتی نیە لە ئاینی ئیسلام بەلام وە من لام نەداوە لە سوننەتی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) بەڵام من یەک نەفسم هەیە لە ژیان ئەویش ئەمەوێت بیکەمە قوربانی اللە تعالی، وەمن لەوە ئەترسم کە ژن هێنان ڕێگام لێ بگرێت لە جەنگ و تێکۆشان.

(سەرکردەی موسوڵمان) : ئەی باشە بۆچی گۆشت ناخۆیت؟

(عامر): گوتی: نەخێر ئەگەر بەدەستم کەوت و دڵم چوو بۆی ئەوا ئەی خۆم ئەگەر نا ئەوا نای خۆم .

(سەرکردەی موسوڵمان): باشە ئەی بۆ پەنیر ناخۆیت؟

(عامر): ئێمە لەگەڵ خەڵکی (مەجوس) ئاگر پەرستەکان زۆر نزیکین وە ئەوان جیاوازی ناکەن لە نێوان (هێون)ی ئاژەڵی مرداربوو و ئاژەڵی زیندوو بۆیە ئەترسم هی ئەم ئاژڵانە بێت کە مردووە ئەگەر دوو شایەتی موسوڵمان گووتیان: ئەوا هی ئاژەڵی زیندوە ئەوا ئەی خۆم .

(سەرکردەی موسوڵمان): ئەی باشە بۆ نایەتە مەجلسی گەورە پیاوان؟ (عامر): گوتی: خەڵک زۆرە کە ئیش و کاری بە دەسەلاتدار و گەورە پیاوان هەیە با بۆ ئەوان بێت واز بهێنن لەوانە کە نایانەوێت.
قسەکانی (عامر) یان بەرز کردەوە بۆ لای پێشەوا (عوسمانی کوڕی عەفان) ئەویش هیچی تێدا نەبینی کە پێچەوانەی ئەهلی سوننە و جەماعەت بێت، بەڵام ئاگری شەری نەکوژاندەوە بۆیە (عوسمانی کوڕی عەفان) فەرمانی پێ کرد کەوا شاری بەسرا بەجێ بهێلێت بەرەو (شام) بکەوێتە رێ و فەرمانی کرد بە (موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان) کە رێزی لێ بگرێت و جێگایەکی بداتێ، ئینجا (عامر) رۆژی بەجێ هێشتنی خەڵکێکی زۆر هەر لە قوتابیەکان و برادەرکان هاتن بۆ ماڵئاوای و بەرێکردنی ئەویش گوتی: خەڵکینە من دوعایەک ئەکەم ئێوەش بڵێن ئامین خەڵکەکە هەمووی چاوی ئەبلەق بوو بێ دەنگ بوو ئاخۆ ئەبێ چ دوعایەک بکات چونکە دوعاکانی گیرا ئەبوو گوتی: (خوایە ئەوەی ئەم بوختان و درۆیانەی بۆ هەلبەستاوم و بۆتە هۆی ئەوەی من و برادەران لێک بکات و بۆتە هۆی ئەوەی لە ولاتی خۆم دەر بە دەربم خوایە من لێ خۆش بوم تۆش لێ خۆش بە و خوایە بی پارێزە لە دونیاو قیامەت خوایە من و هەموو موسوڵمانان بخە ژێر رەحمەتی خۆت و لێمان خۆش بە ئەی خوای بەزەیی) چەند جوانە ئەم ووشانە دەبا ئێمەش ئەوا گەردەنی یەکتری ئازاد بکەین لە کەم و کوری یەکتری ببەخشین ئەگەر خۆمان پێ ئیمانداره.

ئینجا بەرێ کەوت بەرەو ولاتی (شام) جا لەویێش بەرەو ولاتی فەلەستین بەرێ کەوت (مزگەوتی ئەقسای) کردە شوێنی خۆی و کاتێک نەخۆشی مردنی بوو زۆر گریا، گوتیان: بۆ ئەگریت ئەی ئەوە نیە تۆ وات کر تۆ وات کرد ئەویش گوتی: (بەخوا بۆ ژیانی دونیا ناگرییێم و لە مردنیش ناترسم بەڵام ئەترسم لە سەفەری دوور و درێژ و کەمی زادە و زەخیرە، ئێوە نازانن من پێش ئێستا باوەڕەکەم کەم و زیادی کردووە نازانم بۆ ئاگری دۆزەخە یان بۆ بەهەشتی پان وبەرینە) ئینجا چاوەکانی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و دوایین کۆتایی هەناسەی دا و روحی تەسلیم کرد. ڕەحمەتی الله تعالی لە (عامر) و سەرجەم موجاهید و کەلە پیاوانی ئیسلام بێت.

# وێنەی سێیەم:
# عوڕوەی کوڕی زوبەیر

عبدالملک کوڕی مەروان دەیفەرموو: هەر کەسێک حەز ئەکات تەماشای پیاوێک بکات کە بەهەشتیە با تەماشای عورەوەی کوری زوبێر بکات.

ماڵی خوای گەورە ئەدرەوشایەوە بەتیشکی زێرینی ڕۆژ کە لە نێوان کاتی عەسر و ڕۆژئاوا بوون بوو، کەعبەی پیرۆز هێمنی باڵی بەسەردا کێشابوو، و دەنگی دوعاو پارانەوەی هاوەڵە بەرێزەکانی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) و تابعیەکان ئەهات و خەڵک بەهێمنی کۆببونەوە لە چواردەورەی زانا بەرێزەکان بۆ وەرگرتنی زانیاری شەرعی، وە لە تەنیشت ڕوکنی یەمانی چوار گەنجی دەموچاو رووناک نەسەب پاک و دەم بە ویردو زیکری خوا دانیشتبون ئەت گوت کۆتری مزگەوتن دڵ پاک و خاوەن زانست ئەوانەش: (عبداللّٰەی کوڕی زوبێر و براکەی موسعەبی کوری زوبێر و برایەکەی تریان عوروەی کوڕی زوبێر و عبدوالملک کوڕی مەروان) بە هێمنی لە نێوان خۆیان دا گوتیان: با هەر کەسێک لە ئێمە بخوازیت چ داوا ئەکات لە دونیا واتا ببێت بەچ لە دونیا ؟

عبداللّٰەی کوڕی زوبێر: من ئاواتم ئەوەیە ببم بە دەسەڵاتدار لە ناوچەی حیجاز.

موسعەبی کوڕی زوبێر: من ئەمەوێت ببم بە دەسەڵاتدار لە عیراق .

عبدوالملک کوڕی مەروان: بەڵام من لە ئێوە بەتەماع ترم ئەمەوێت ببم بە خەلیفە لە دوای موعاوەیەی کوڕی ئەبو سوفیان (رەزای خوای لێ بێت) .

وە ڕوویان کردە عوروەی کوری زوبێر گوتیان: تۆ بۆ بێ دەنگی حەز ئەکەیت ببیت بەچ لە دونیا ؟

عوروەی کوری زوبێر: فەرمووی: خوای گەورە بەرکەت بکاتە ئەوەی کە داواتان کردوە لە دونیا، بەڵام من ئەمەویت ببم بە زانایەکی ئیش کەر بۆ ئاینی الله و خەڵک سوودم لێ وەربگرێت لە ژیانی کۆتاییدا ڕەزامەندی خوای گەورە بەدەست بهێنم و بچمە بەهەشتەوە .

ڕۆژان هات و ڕۆژان ڕۆیشت عبداللهی کوری زوبێر بوە خەلیفە لە پاش مردنی یەزیدی کوری موعاویە و هەموو ناوچەی حیجاز و یەمەن و عیراق و خوراسانی کەوتە ژێر دەستی دوای کوژرا لەنزیک ئەم جێگایەی کە دانیشتبون.

و موسعەبی کوری زوبێر لەلایەن عبداللهی کوری زوبێر برایەوە ئەکرێت بە دەسەڵاتدار لە سەر عیراق وە ئەویشیان کوشت، وە عبدوالملک کوڕی مەروان بووە خەلیفە لەپاش مردنی باوکی موڵکی هەموو دونیای گرتە دەست ئەی بزانین عوروەی کوڕی زوبێر بو بە چ؟

وەرن باپێکەوە بزانین بەسەرهاتی ئەم کەڵە پیاوە چیە؟

عوروەی کوڕی زوبێر لە دایک بوونی یەک ساڵ مابوو لە خیلافەتی پێشەوا عومەر (رەزای خوای گەورەی لێبێت) لە یەکێک لە هەرە ماڵە

پاک و دەست پاک و دیندار بوون، باوکی زوبێر کوری عەوام حەواری پێغەمبەری ئازیزە (ﷺ) یەکەم کەس بو شمشێری راکێشا لەپێناوی الله تعالی و یەکێکە لەو دەکەسەی کە موژدەی بەهەشتیان پێ دراوە لەسەر دونیا، و دایکی (ئەسماء ) کچی ئەبوبەکری سدیق (رەزای خوای لێبێت) و باپیری لە دایکیەوە ئەبوبەکری سدیق (رەزای خوای لێبێت) جێ نشینی پێغەمبەری ئازیزە بوو (ﷺ) وە داپیرەی لە باوکیەوە (سەفیەی کچی عبدولمتەلب) ئامۆژنی پێغەمبەرە (ﷺ) وە پوری (عایشە کچی ئەبوبەکری سدیقە) خوای گەورە لە خۆی و باوکی رازی بێت، ئایا لەم نەسەبە شەریفتر هەیە جگە لە نەسەبی ئیمان و ئیسلام ؟

وە ئەم کەڵە پیاوە بۆ ئەوەی ئاواتەکەی بێتە دی هەڵسا بە داواکردنی زانستی شەرعی لە شوێن پێی هاوەڵە بەرێزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەکەوت لە ماڵەوەیان و دەرەوە و نوێژکردنیان و بۆ ئەوەی ئەم زانستە شەرعیانەیان لێ وەربگرێت تاوەکو فەرموودەی گێرایەوە لە ( عەلی کوڕی تالیب و عبدالرحمن کوڕی عەوف و زەیدی کوڕی سابت و ئەبو ئەیوبی ئەنساری و ئوسامەی کوڕی زەید و سەعیدی کوڕی زەید و ئەبو هوریرە و عبداللەی کوڕی عەباس و نوعمانی کوڕی بەشیر و بەشێکی زۆری زانست لە پوری کە عایشە بوو رەزاو ڕەحمەتی الله تعالی لە هەموویان بێت وەرگرت.

تاوەکو بووە یەکێک لەو حەوت زانایای شاری (مەدینە) کە خەڵک ئەگەر کێشەیان بۆ دروست ببوایە ئەهاتنەوە لای، و دەسەڵاتدارەکان پرس و رایان پێ ئەکردن لە ئیش و کاری دین و دونیا .
لەوانە (عومەری کوڕی عبدالعزیز) کاتێک بوە دەسەڵاتدار لە شاری مەدینە کە رەوان کرابوو لەلایەن (عبدالملک کوڕی مەروان) خەڵک هاتوو پێشوازیان کرد لە عومەر ئینجا نوێژی نیوەڕۆیان کرد ئینجا ئەو داوای کرد کە دە زانای شاری مەدینە ببینێت لە سەرەوەی هەموویان عوروەی کوڕی زوبێر بوو ئینجا پاشان بەخێر هاتنی کردن و پێشوازی لێ کردن و رێزی لێ گرتن و سوپاسی خوای گەورەی کرد گوتی: ( من داوام لە ئێوە کردوە بێن بۆ ئێرە بۆ ئیشێک کە پاداشت لە لایەن خوای گەورە وەرئەگرن وە ئێوە ئەبن بەپشتی من لەسەر ڕاستی و من نامەوێت هیچ ئیشێک بکەم بەبێ پرسی ئێوە و ئێوەش ئەبێت ئاگادار بن ئەگەر بینیتان یەکێک زوڵم لەوەی تر ئەکات یان بینیتان یەکێک لەپیاوانی من زوڵم ئەکات داوتان لێ ئەکەم ئاگادارم بکەنەوە ) ئینجا عورەوەی کوڕی زوبێر دوعای خێری بۆ کرد و هیوادار بوو کە سەر بکەوێت .
عورەوەی کوڕی زوبێر ئەم زانستەی کە هەی بوو بەکردەوە جێبەجێ ئەکرد بە ڕۆژی گەرم بە ڕۆژوو ئەبوو بەشەوی تاریک شەو نوێژی ئەکرد زمان پاراو بوو بە زیکری خوای گەورە و زۆر برادەر بوو لەگەڵ قورئانی پیرۆز هەموو رۆژ سێ چارەکی قورئانی پیرۆزی ئەخوێندەوە لە موسحەف و شەویش ئەوەی تری مابوو لە بەری ئەخوێندەوە بەردەوام وابوو هەر

لەو کاتەی گەنجێکی ناسک تاوەکو پیربونی و مردنی نەزانراوە وازی لێ هێنابێت یەک جار نەبێت کە ئێستا ڕوونی ئەکینەوە، عوروەی کوڕی زوبێر نوێژ ببووە گلێنەی چاوی ببووە بەهەشتی لەسەر زەوی ئەوەندە جوان نویژی ئەکرد هەر لە راوەستانی و کرنۆش بردنی و قورئان خوێندنی زۆر دوور و درێژی ئەکردەوە، ئەوەتا جارێکیان کابرایەکی بینی نوێژی ئەکرد بەڵام نوێژەکەی زۆر کورت کردەوە، کە تەواو بوو، عوروەی کوڕی زوبێر پێ گوت: (کوڕی برام ئەوە هیچ کارێکت بە خوای گەورە نەبوو؟ بەخوا من هەموو شتیک داوا ئەکەم لە خوای گەورە تاوەکو خوێش داوا ئەکەم) ، عوروەی کوڕی زوبێر زۆر دەست کراوە بوو لە خێر کردن تاوەکو ئەگێڕنەوە کە لە شاری مەدینە جوانترین بێستانی هەبوو کە هیچ بێستانێک لەم شارە وەک هی ئەو نەبوو هەر لە ئاوی سازگاری و بەرو بوومی جوانی و سێبەری بلاوی و تاوەکو ساڵ دوانزەی مانگ چوارچێوەی بۆ ئەکرد نەوەکو مەرو مالات بچێتە ناوەوە، بەردەوام بەروبومی هەبوو ئینجا تاوەکو پێ ئەگەیشت بەروبومەکەی لە چەند شوێنێکەوە چوار چێوەی بێستانەکەی ئەروخاند بۆ ئەوەی خەڵک بە ئارەزووی خۆی بچێتە ناوەوە چەندی پێ ئەخورێت بیخوات و چەندی پێ ئەبدرێت بیبات، وە عوروەی کوڕی زوبێر (ڕەحمەتی الله تعالى لێبێت) هەر کە ئەچوە ناو بێستانەکەی ئەم ئایەتەی الله تعالى ئەخوێندەوە:

**{وَلَوْلَا إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَاءَ اللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ ۚ إِنْ تَرَنِ أَنَا أَقَلَّ مِنْكَ مَالًا وَوَلَدًا}**[1] واتە: کاتێک بچیتە ناو بێستانەکەتەوە بلیت ماشاء الله هیچ هێزێک نیە تەنها هێزی الله نەبێت .

وە لە یەکێک لەساڵەکانی خیلافەتی وەلیدی کوڕی عبدالملک کوڕی مەروان خوای گەورە ویستی بوو کە عوروەی کوری زوبێر تاقی بکاتەوە بە تاقیکردنەویەک کە کەس ناتوانی بەرگەی بگرێت تەنها مەگەر خاوەن باوەڕێکی بەهێز بێت، و دڵنیا کی زۆر بەهێزی هەبێت ئەوە بوو وەلیدی کوڕی عبدالملک کوڕی مەروان عوروەی کوڕی زوبێری بانگ کرد بۆ شاری (دیمەشق) بۆ میوانداری کە گەیشتە لای خەلیفە زۆر بە جوانی پێشوازی لێ کرد و رێزی لێ گرت ئەوان لە قسەکردن بوون کوڕی عوروەی کوڕی زوبێر چووە شوێن بەخێوکردنی (ئەسپەکان)

بۆ تەماشاکردنی یەکێک لە ئەسپەکان هەلبەزیەوە و کەوتە کوتانی کوڕی عوروەی کوڕی زوبێر وە تاوکو گەیشتن بە منداڵەکە گیانی سپاردبوو، ئەم باوکە جەرگ سوتاوە تازە لە شاردنەوەی کوڕەکەی هاتبونەوە تاوەکو هەستی بە ئازارێکی زۆرکرد لە یەکێک لە قاچەکانی کە دکتۆر بینی گوتی: قاچت توشی (وەرەم) بووە خەلیفە دکتۆرەکانی کۆکردەوە بۆ ئەوەی چارەسەری میوانەکەی بکەن بەلام دکتۆرەکان گوتیان: ئەبێت قاچی ببرێتەوە ئەگەر نەبرێتەوە ئەوا تەشەنا ئەکات بۆ

---

[1] - الکهف.٣٩

هەمو گیانی وە ئەبێتە هۆی مردنی، و کاتێک دکتۆر گوتی: ئەبێت کەمێ (ئارەق) بخۆیتەوە بۆ ئەوەی کاتێک کە قاچمان بریتەوە ئاگات لە خۆ نەمێنیت، عوروە (ڕەحمەتی الله تعالی لێبێت) گوتی: شتی وا نابێت نامەوێت پشت ببەستم بە شتی حەرام، ئینجا کۆمەڵێک پیاو هاتن گوتی: ئەم پیاوانە بۆچی هاتوون گوتیان: با بت گرن کاتێک قاچت ئەبرنەوە، گوتی: (نەخێر من کەسم ناوێت زیکری خوا ئەکەم ئێوەش قاچم ببرنەوە) ئینجا کاتێک دکتۆر مینشاری لەسەر قاچی دانا بیبرێتەوە گوتی (لاالە الاالله، الله اکبر)

ئینجا قاچیان بریەوە و ڕۆنیان قرچاندەوە گەرم کرد بۆ ئەوەی داخی بکەن تاوەکو خوێن بەربون رابوەستێ، بەڵام ئەو هەر زیکری خۆی ئەکرد ئینجا کاتیک ڕۆنەکیان بەسەر داکرد لە هۆش خۆی چوو نەی توانی ئەم ڕۆژە قورئان خوێندنەکەی وەکو جاران بخوێنێت ئەمە یەکەم جار بوو کە قورئان خوێندنەکەی لە دەست بچێت، وە کاتێک بەخۆی هاتەوە قاچە براوەکەی بەدەست گرت گوتی: (سوێند بەو خوایەی کە منی لەسەر تۆ هەلگرتبوو کاتێک لە شەوە تاریکەکان پێ ئەرۆیشتم بۆ مزگەوت تاوەکو ئێستا پێ نەچومە بۆ گوناە )

بەڕاستی خەلیفە وەلیدی کوڕی عبدالملک کوڕی مەروان زۆر دڵی ناخۆشبوو بەوەی کە بەسەر میوانەکەی هات و دڵ گران بوو، قەدەری خوای گەورە خەلیفە وەلیدی کوڕی عبدالملک کوڕی مەروان چەند میوانێکی هاتبوو لە (هۆزی عەبەس) دانیشتبوون کابرایەکی کوێریان

تێدا بوو، خەلیفە پرسیاری لە کابرای کوێر کرد باشە بۆچی چاوت کوێر بووە؟

کابرا گوتی: (ئەی خەلیفە من لە هۆزەکەی خۆم دەوڵەمەندترین کەس بووم لە هۆزەکەی خۆم لە ماڵ و منداڵ مەر و مالات سەروەت و سامان، ئینجا ڕۆژێك بە ماڵ و منداڵەوە ڕۆیشتم بۆ یەکێک لە دۆڵەکان لەوێ ژیان ببمە سەر شەوماینەوە لەو شوێنە کاتی شەو یەک باران دەستی پێکرد لافاو هەرچی ماڵ و منداڵ و خێزان و مەڕ و ماڵتم هەبوو هەمووی ڕۆیشت لەگەڵ لافاوەکەدا تەنها یەک منداڵی شیرە خۆرە و یەک حوشترم بۆ جێما، حوشترەکە زۆر هار و هاج بوو حەبلەکەی ملی پچراند و هەلات منیش چووم بە دوای حوشترەکە بیهێنمەوە کەمێ دوور کەوتمەوە بینیم دەنگی گریانی منداڵەکە بەرزبوویەوە تا ئاورم دایەوە بینیم منداڵەکە لەدەمی (گورگێکە) وا ئەی خوارد منیش دوای حوشترەکە کەوتم نزیک بومەوە یەک لەقەی دا لە چاوانم هەردوو چاوی کوێر کردم، بە یەک شەو بەبێ ماڵ و منداڵ و چاوەکەم مامەوە)

ئینجا خەلیفە وەلیدی کوڕی عبدالملک کوڕی مەروان بە حزمەتکارەکەی گوت: هەلسە برۆ ئەم کابرا کوێرە ببە لای عورووەی کوڕی زوبێر بۆ ئەوەی بزانێت کە خەڵکی تر هەیە لەو زیاتر ناخۆشی بەسەر هاتووە.

وە کاتێک عورووەی کوڕی زوبێر یان بردەوە بۆ شاری مەدینە و کاتێک گەیشتەوە ماڵەوە و چووە ژوورەوە بە خێزانەکەی گوت:

(نەکەن دڵتان تەنگ بێت و خەم مەخۆن خوای گەورە چوار کوری پێ داوم یەکێکیانی بردەوە و چوار دەست و قاچی پێ دام یەکێکیانی بردەوە بۆ خۆی وە الحمدلله زۆری پێ داوم و کەمی بردەوە بۆ خۆی وە ئەگەر یەک جار تاقیکردمەوە ئەوە چەند جارێک خۆشی لەگەڵم کردوە)

خەڵک لە هەموو لایەک دەهاتن سەرخۆشیان لێ دەکرد جوانترین کەس کە سەرەخۆشی لێ کرد (ئیبراهیم کوڕی تەلحە) بوو گوتی: (موژدەت لێ بێت ئەی باوکی عبدالله یەکێک لە منداڵەکانت و یەکێک لە قاچەکانت پێش تۆ کەوتن بۆ بەهەشت وە هەموو دوای یەک ئەکەوێت ان شاءالله، وە خوای گەورە تۆی بۆ ئێمە هێشتەوە بۆ ئەوەی زانستت لێ وەربگرین، خوای گەورە پاداشتت بداتەوە).

عورەوەی کوڕی زوبێر بەردەوام بوو لە بڵاوکردنەوەی زانستی شەرعی وە بەردەوام بەمنداڵەکانی ئەگوت: (کوڕەکانم فێری زانست بن و هەوڵی بۆ بدەن چونکە ئەگەر چەند بچوک بن لەچاو خەڵک ئەوا گەورە ئەبن ئایا چ شتێکی ناشرین تر هەیە لەوە کە مرۆڤ پیر ببێت و نەزان بێت؟) وە عورەوەی کوڕی زوبێر وای ئەزانی کە خێرکردن دیارێک بوو: ئەدەیت بە خوای گەورە، بۆیە دەی فەرموو: ( کوڕەکانم ئەگەر یەکێکتان دیاریتان دا بەخوای گەورە با دیاریکی جوان بێت، و ئەی فەرموو: کوڕەکانم ئەگەر بینیتان پیاوێک کارێکی چاکی کرد ئەوا هانی بدەن بۆی با لە چاو خەڵکانێکی تر هیچ کێش و ڕێزی نەبێت وە ئەگەر بینیتان پیاوێک ئیشێکی خراپی کرد پێ بلێن با لە چاو خەڵکی تر باش بێت) و بەردەوام

ئامۆژگاری ئەکردن بەنەرمی ئەی گوت: (کوڕەکانم لە قسەی پیاو چاکان داهاتووە باقسەکانت نەرم و چاک بێت و دەم و چاوت گەش بێت و ئەبیتە خۆشەویسترین کەس).

ئەگەر کاتێک بیبینایە خەڵک ڕوو چوونە لە سەرف کردنی بێ سوود ئەوا ئەو ئاگاداری ئەکردنەوە و بەو ژیانەی کە پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) تێدابوو لە نەبونی و گرانی ئەوەتا (محمدی کوڕی کیندەرە) ئەفەرمووێت: گەیشتم بە عورووەی کوڕی زوبێر گوتی: پێم باوکی عبداللە.

گوتم: بەڵێ،

گوتی: (من گەیشتم بە دایکە عایشە گوتی: کوڕی خۆم، گوتم: بەڵێ،

گوتی: جاری واهەبوو لەگەڵ پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) جاری وا هەبوو چڵ شەو ئاگر لە ماڵی ئێمەدا هەڵنەئەبوو ئەڵێت منیش گوتم: دایەگیان بەچی ئەژیان؟ گوتی: دوو شتە ڕەشەکە مانای ئاو وخورما).

ئینجا عورووەی کوری زوبێر ژیانێکی پر لە خێر و بەرەکەتی بردە سەر.

جا تاوەکو کۆتایی ژیانی هات ئەو ڕۆژەی کە تیایدامرد نەخۆش کەوت وە بە ڕۆژوو بوو چەندی پێیان گوت: ڕۆژووە کەت بشکێنە. گوتی: نەخێر ئەمەوێت کە بگەم بەخوای گەورە بە زمانی بەڕۆژوو بگەمەوە بەخوای گەورە و ئەو حەزی ئەکرد بگاتەوە خوای گەورە بە ڕۆژو بێت و لە ئاوی کەوسەر بخواتەوە ئینجا گیانی سپارد بە خوای گەورە.

ڕەحمەتی خوای گەورەت لێبیت ئەی عورووەی کوڕی زوبێر سەلامت لێبێت لە بەهشتانێکی نەبراوە.

# وێنەی چوارەم:

# ڕەبیعی کوڕی خەیسوم

هاوەڵی بەڕێز عبداللّهی کوڕی مەسعود ( ڕەزای الله تعالی لێبێت) ئەی فەرموو: ئەی باوکی یەزید ئەگەر پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) تۆی ببینایە خۆشی ئەویستی.

(هیلالی کوڕی ئوساف) فەرمووی: (بە مونزیری سەوری) ئەتەوێت کەمێ بچین باوەری خۆمان زیاد بکەین لای ئەم شێخە؟

(مونزیری سەوری) فەرمووی: بەڵێ منیش حەز ئەکەم بچین بەخوا من تەنها هاتوومە بۆ شاری (کوفە) بۆ بینینی ئەم مامۆستایەت (ڕەبیعی کوری خەیسوم) بەڵام ئایا ئیزنت لێ وەرگرتوە کە ئێمە دێین بۆ لای؟ چونکە من پێم گەیشتوە کە لەوەتەی تووشی نەخۆشی (ئفلیج) بون بووە لە ماڵەوە ناتوانێ بچێتە دەرەوە لەگەڵ خوای گەورە زیاتر نزیک بۆ تەوە

(هیلالی کوڕی ئوساف) فەرمووی: نەخێر ئەو هەر وایە لەوەتەی (شاری کوفە) ناسیویەتی نەخۆشییەکەشی هیچی لێ نەگۆڕیوە.

(مونزیری سەوری) فەرمووی: مەگەر تۆ نازانی ئەم پیاوە بەڕێزانە چەند سیفەتێکی تایبەتیان هەیە تۆزێک ناسکن بۆ ئەم شتانە؟!

ئایا ئەگەر چوین بۆ لای پێی بلێین بۆچی هاتووین؟

یان ئەو بۆ خۆی قسە ئەکات؟

(هیلالی کوڕی ئوساف) فەرمووی: تۆ نازانی بەخوا ئەگەر لەگەڵ (رەبیعی کوڕی خەیسوم ) یەک ساڵ دابنیشی ئەگەر تۆ پرسیاری لێ نەکەی ئەو دەمی ناکاتەوە قسەت لەگەڵ بکات ئەگەر تۆ پێشەکی قسەی لەگەڵ نەکەیت! چونکە ئەو قسەکانی هەموو کردۆتە زیکر و یادی خوای گەورە وە بێ دەنگی خۆی کردۆتە بیرکردنەوە.

(مونزیری سەوری) فەرمووی: دەباشە با هەڵسین ناوی خوای لێببینین بچین بۆلای .

هەر دووکیان چوون بۆ لای سڵاویان لێ کرد.

گوتیان: چۆن بویت ئەم بەیانییە ئەی مامۆستا؟

(رەبیعی کوڕی خەیسوم) گوتی: ئەم بەیانییەم کردەوە بێ هێز و گوناە بار و چاوەروانی ئەجەلم ئەکەم.

(هیلال) فەرمووی: ئەزانی دکتۆرێکی زۆرچاک هاتووە بۆ شاری (کوفە) بۆ بانگی نەکەم تاوەکوو بزانێت چیتە؟

(رەبیعی کوڕی خەیسوم) فەرمووی: ئەی هیلال من ئەزانم دەرمان خواردن و چارسەرکردن راستە، بەڵام من بیرم کردەوە لە خەڵکەکانی پێشتر وەک گەلی (عاد) و(سەمود) و (ئەسحاب الرس) وە چەند سەدێک لە نێوانیان کە چەند بەردەوام غەمی دڵیان و دونیاو خۆشییەکانی بوون زۆر لە ئێمە بەهێزتر بوون و زۆر بەدەسەڵاتتر بوون ئەوان دکتۆر و نەخۆشیان تێدابوو، بەڵام نە نەخۆشەکان ماون و نە دکتۆرەکان، دوایی

کەمێ بێ دەنگ بوو، گوتی: ئەگەر ئەمە نەخۆشیەکەمانە ئەوا دەرمان هەیە، بەلام ئەمە نەخۆشییەکەمان نییە .

(مونزیر) فەرمووی: بە یارمەتیت مامۆستا! ئەی باشە دەردی کوشندەی ئێمە چییە؟؟

(رەبیعی کوڕی خەیسوم) فەرمووی: دەردی ئێمە گوناە و تاوانە .

(مونزیر) فەرمووی: ئەی دەرمان؟

(رەبیعی کوڕی خەیسوم) فەرمووی: دەرمان تەوبەکردن و پەشیمان بوونەوەیە.

(مونزیر) فەرمووی: باشە چۆن چارەسەر ئەکرێت؟

(رەبیعی کوڕی خەیسوم) فەرمووی: تەوبەیەکی وابکەیت کە هەرگیز نەگەرێیتەوە بۆ سەرگوناە و تاوان، دوایی سەری بادا گوتی: ئاگاتان لە خۆبێت لەگوناە کردنی شاراوە، چونکە لەلای خوای گەورە ئاشکرایە دەست بگرن بە دەرمانەکەی.

(مونزیر) فەرمووی: دەرمانی چییە؟

(رەبیعی کوڕی خەیسوم) فەرمووی: دەرمانەکەی تەوبەکردنێکی وا کە هەرگیز نەگەرێیتەوە سەری، دوای ئەوەندە گریا تاوەکو ریشی پیرۆزی تەربوو .

(مونزیر) فەرمووی: ئایا تۆ ئەگریت کە پیاوێکی ئاوا بەناوبانگی لە چاکە.

(رەبیعی کوڕی خەیسوم) فەرمووی: زۆر دوورە لەوەی کە ئەیبینی

لەچاکەی من، بەخوا گەیشتین بە پیاونێک مەبەستی هاوەڵە بەرێزەکانی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) بوو، ئێمە لە چاو ئەوان دز بووین،
دوایی کوڕەکەی هاتە ژوورەوە گوتی: باوکە گیان دایکم (شیرینی) بۆ دروست کردویت وە زۆر حەز ئەکات تۆلێ بخۆیت، گوتی: باشە بیهێنە کە چوو بیهێنێت کابرایەکی (سواڵکەر) لەدەرگای دا گوتی: بابێتە ژورەوە کە فەرموویان لێ کرد بینیان کابرایەکی جل شر و لیکی بەدەم دا ئەهاتە خوارەوە شرو وێل!
(رەبیعی کوڕی خەیسوم) فەرمووی: دابنێن لە بەردەمی ئینجا کابرا دەستی کرد بەخواردنی وای ئەلوشییەوە لیکی دەمی بەسەر خواردنەکەدا ئەکرد تاوەکو هەمووی تەواو کرد، ئینجا کوڕەکەی گوتی: ئە! باوکە گیان دایکم ئەوەندە خۆی ماندوو کرد بۆ ئەوەی بۆتی دروست کرد، ئێستاش تۆ داتنا لەبەردەم ئەم کابرایە کە نەیزانی چۆنی خواردی ؟!
(رەبیعی کوڕی خەیسوم) فەرمووی: کوڕە شیرینەکەم ئەگەر ئەو نەیزانی خۆ خوای گەورە ئەزانێ دوایی ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزی خوێندەوە:
{لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّىٰ تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ ۚ وَمَا تُنْفِقُوا مِنْ شَيْءٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِ عَلِيمٌ }[1] واتە: هەرگیز ناگەن بەچاکەی تەواو تاوەکو ئەمەی کەپێتان خۆشە نەی بەخشن وە هەرشتیکیش ببەخشن لە پێناوی خوا ئەوا خوای گەورە پێی ئاگادارە.

[1] - ال عمران.٩٢

ئینجا لەم قسانەدا بوو کابرایەکی خزمی خۆی هاتە ژورەوە، گوتی: ئەی باوکی یەزید ئەزانی (حسین ی کوڕی فاتیمە) کوژرا!!
(ڕەزای اللە تعالی لەخۆی و دایکی بێ)
(رەبیعی کوڕی خەیسوم) فەرمووی: (اناللە وانا الە راجعون)، دوایی ئەم ئایەتەی خوێندەوە:
**{قُلِ اللَّهُمَّ فاطِرَ السَّماواتِ وَالْأَرْضِ عالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهادَةِ أَنْتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبادِكَ فِي ما كانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ }**[١] واتە: بلێ اللە دروست کەری ئاسمانەکان وزەوییە، زانیاری شاراوەکانی پێیە، خوایە تۆ خۆت لەنێوان بەندەکان حوکم ئەدیت .
بەلام کابرا تێنەگەیشت مەبەستی چی بوو لەم ئایەتە،
گوتی: لە مەبەستت تێنە گەیشتم چی ئەلێیت لەبارەی کوشتنی؟
ئینجا (رەبیعی کوڕی خەیسوم ) فەرمووی: ئەلێم (ئەگەڕێنەوە لای خوای گەورە وە هەرخۆی لێکۆلینەوەیان لەگەڵ ئەکات.
(هیلال) فەرمووی: بینیم کاتی نیوەڕۆ نزیک بۆتەوە گوتم: ئەی مامۆستا ئامۆژگاریم بکە .
(رەبیعی کوڕی خەیسوم) فەرمووی: ئەی هیلال (هەلنەخەڵەتێ بە مەدح و سەنای خەڵک، چونکە خەڵک تەنها لە ڕوالەت ئەزانن، وە بزانە

[١] - الزمر.٤٦

تۆ لەلای خوای گەورە بەکردەوەکانت ئەناسرێیتەوە، وە هەر کردە وەیەک لەپێناو خوای گەورە نەبێت ئەوا نامێنێت.
ئینجا (مونزیر) فەرمووی: منیش ئامۆژگاری بکە ڕەحمەتی خوات لێبێت (رەبیعی کوڕی خەیسوم) فەرمووی: (ئەی مونزیر لە خوای گەورە بترسە کە ئەزانیت، وە ئاگاداربە ئەگەر شتێکت نەزانی بیگەڕێنەوە لای ئەو کەسەی کەئەزانێ، ئەی مونزیر نەکەی بلێی خوایە تەوبە ئەکەم دوای نەیکەی ئەبیت بەدرۆ بەلام با بەشێوەی دوعاو پارانەوە بێت بلێ خوایە لێم خۆشبە، وە بزانە مونزیر قسە هیچ خێری تێدانییە تەنها وشەی (لااله الاالله ) نەبێت، وە وشەی (الحمدلله) وە وشەی (الله اکبر) وە وشەی (سبحان الله) وە داوای (خێر و چاکە) بکەیت و خۆت بپارێزیت لە (خراپە) وە (فەرمان بکەیت بەچاکەو نەهی بکەیت لەخراپە) وە خوێندنی قورئانی پیرۆز.
ئینجا (مونزیر) فەرمووی: ئێمە لەگەڵ تۆ دانیشتوین گوێمان لە (شیعر) خوێندنەوە نەبوو کەچی برادەراکانی تۆ ئەیان خوێندەوە؟
(رەبیعی کوڕی خەیسوم) فەرمووی: هەر شتێک بڵێیت لە دونیا لە ڕۆژی قیامەت بۆت ئەنوسرێت و ئەخوێندرێتەوە وە من پێم ناخۆشە کە یەک دێر شیعر لەپەرتوکی کردەوەکانم بنوسرێت، دوایی بۆم بخوێندرێتەوە لە ڕۆژی دوایی، دوایی ڕووی لە هەمووما‌ن کردو گوتی: (زۆر یادی مردن بکەنەوە چونکە مردن ئەم شتە بزرەیە کە چاوەڕێتان ئەکات چونکە

شتی بزر و دوور کە نزیک بوو وادەی هاتنی ئەوا خاوەنەکەی چاوەڕێ ئەکات) دوایی دەستی بەگریان کرد.

گوتی: چی ئەکەیت کاتیک کە خوای گەورە ئەفەرمووێت: **{كَلَّا إِذَا دُكَّتِ الْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا () وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا () وَجِيءَ يَوْمَئِذٍ بِجَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ الْإِنسَانُ وَأَنَّى لَهُ الذِّكْرَىٰ}**[1] واتە:

نەخێر، (هەر ئاوا بۆتان نالوێت)، کاتێك دێت کە زەوی ورد و خاش دەکرێت و لەناکاو دەدرێت بەیەکدا.

پەروەردگارت دێت و فریشتەکانیش پۆل پۆل.

ئەو ڕۆژە دۆزەخ دەهێنرێت و نیشان دەدرێت، جا ئەو ڕۆژە (ئادەمیزادی بێ باوەڕ) دەزانێت چ پەندێکی بەسەر خۆی هێناوە، بەڵام تازە بەخۆدا هاتنەوە و پەشیمانی هیچ سوودێکی نیە و دادی نادات؟!

ئینجا هیلال فەرمووی: خەریک بوو لە قسەکانی تەواو بێت بانگی نوێژی نیوەڕۆی دا ئینجا (ڕەبیعی کوڕی خەیسوم ) ڕووی لە کوڕەکەی کرد گووتی: ڕۆلە وەرە با وەڵامی خوای گەورە بدینەوە، کوڕەکەی گوتی: بە ئێمە وەرن با یارمەتیم بدەن بۆ ئەوەی بیبەین بۆ مزگەوت .

ئینجا (مونزیر) فەرمووی: ئەی باوکی یەزید خوای گەورە ڕێگای داوە بۆ ئەوەی تۆ لەماڵەوە نوێژ بکەیت!

---

[1] - الفجر ٢١-٢٣.

(ڕەبیعی کوڕی خەیسوم) فەرمووی: ڕاست ئەکەیت بەڵام کاتێک ئەفەرموونێت: (وەرن بۆ بردنەوەی چاکە) ئەگەر یەکێکتان گوێ لە یەکێک بێت بفەرموونێت: (وەرن بۆ بردنەوەی چاکە) ئەبێت وەڵامی بدەیتەوە بچیت، بەرەو ڕووی ئەگەر لەسەر دەست و سکتدا رۆیشتیت.

ئینجا خۆشەویستان بابزانین ئەم کەڵە پیاوە (ڕەبیعی کوڕی خەیسوم) کێیە؟

(ڕەبیع) یەکێکە لە گەورە پیاوانی تابیعی و پێشینە چاکەکان بە بنەچە (عەرەبە) ئەگەڕێتەوە نەسەبی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) لە باپیرەی (ئیاس و مەزەر)، ئەم پیاو چاکە هەر لە منداڵییەوە لەسەر خواپەرستی و نوێژ و عیبادەت پەروەردە بوو، دایکی ئەخەوت و هەڵئەسا ئەیبینی (ڕەبیع) هەر شەونوێژ ئەکات، ئەیفەرموو: ئەی کوڕە شیرینەکەم (ڕەبیع) تۆ بۆ ناخەویت؟

(ڕەبیع) ئەیفەرموو: (ئەی دایەگیان چۆن ئەتوانیت بخەویت کە بزانیت یەکێک بەیانی هێرشت بۆ ئەکات)؟

ئینجا دایکە پیرەکەی فرمێسکی بەچاواندا ئەهاتە خوارەوە و دوعای خێری بۆ ئەکرد، وە کاتێک بووە گەنجێکی دیار و جوان خۆی ڕازاندبوویەوە بەتەقوا، دایکە پیرەکەی ئەگریا و ئەی فەرموو: (ڕۆڵەکەم تۆ بۆ ئەوەندە ئەگریت ئەڵێی یەکێکت کوشتووە)؟؟

(ڕەبیع) گوتی بەڵێ: دایە گیان یەکێکم کوشتوە !!

دایکی بەهاوارەوە ئەی ڕۆلەکەم ئەگەر ئەزانی کێیە با ئێمە و خەڵک بچین سولحت بۆبکەین !

بەخوا ئەگەر ئەزانن کەس و کاری خەڵکە کوژراوەکە ئەوا تۆ ئەبینن بەکوڵ ئەگریت لێت خۆش ئەبوون!!

(رەبیع)ئەی فەرموو: دایەگیان لای کەس وامەڵێ کوژراوەکە خۆمم بەگوناه و تاوان کوشتومە !!!!!

(رەبیعی کوڕی خەیسوم) لە سەردەستی هاوەڵی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) (عبداللّەی کوری مەسعود) پەروەردە بوو ئەوەندە خۆشی ئەویست بەردەوام پێیوە لکابوو، وە (عبداللّەی کوری مەسعود) بەبێ ئیزن وەرگرتن رێگای ئەدابە (رەبیع) بێتە ژورەوە وە ئەگەر ئەویش لە ژورەوە بوو، ئەوا نابوایە کەس بێتە ژورەوە تاوەکو ئەو ئەرۆیشتە دەرەوە

(عبداللە کوری مەسعود) دڵ پاکی و خواپەرستی و دونیا نەویستی (رەبیع)ی ئەبینی بۆیە زۆری خۆش ئەویست وە ئەی فەرموو: ( ئەی باوکی یەزید ئەگەر پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) تۆی ببینایە خۆشی ئەویستی) ئەی فەرموو: (هەرچەند جار تۆ ئەبینم ئەم کەسانەم دێتەوە یاد، کە زۆر زوو ئەگەرێنەوە لای خوای گەورە).

بۆیە هاوەڵی بەرێزی پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) بە بەلاش وای نەفەرمووە!

چونکە لەگەڵ (رەبیع) ئەژیا ئەی زانی چەند پیاوێکی دڵساف و لە خواترس و دونیانەویست بوو، بۆیە گەیشتە ئەم ئاستە کە یەکێک لەبرادەرەکانی فەرمووی: (بروا بکەن بیست ساڵ لەگەڵ رەبیع بەیانیم کردەوە تەنها ئەم ئایەتەی ئەخوێندەوە: {الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ}[1]. واتە: قسەی باش و کردوەی چاک بەرز ئەبێتەوە بۆ لای خوای گەورە.

ئەوەتا (عبدالرحمن کوڕی عەجلان) ئەفەرموێ: شەوێک لەلای (رەبیع) بووم کەدڵنیا بوو من چاوم چۆتە خەووە هەڵسا دەستی بەنوێژ کردن کرد تابەیانی ئەم ئایەتەی ئەخوێندەوە و دووبارەی ئەکردەوە کە خوای گەورە ئەفەرمویت: {أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَنْ نَجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاءً مَحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ}[2] واتە: ئایا واچاوەڕێ ئەکەن ئەوانەی کە کردەوەی خراپیان کردوە وە ئەوان تەماشا ئەکرێن کە باوەریان هێناوە وکردەوەی چاکیان کردوە؟ ئەوانەی مردون و زیندوون وەک یەک وانە؟.

ئینجا ئەی خوێندەوە و ئەگریا تا وەکو بەیانی.

وە لە بەسەرهاتەکانی لە خواترسی و گریانی ئەگێرنەوە کە جارێکیان کۆمەڵێک لەبرادەرەکان و هاوەڵی بەرێزی پێغەمبەری سەرووەر (ﷺ) ئەرۆیشتن لە لێواری روباری (فورات) بینیان (کوورە)یەک گەرم ئەکرا و

---

[1] - فاطر١٠

[2] - الجاثية.٢١

گڕی گرتبوو بۆ دەرهێنانی (كلس)، كە ئەم شێوەیەی بینی راوەستا و توشی لەرزینیک بوو و ئەم ئایەتەی خوای گەورەی خوێندەوە، کە ئەفەرمووێ: {إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍ بَعِيدٍ سَمِعُوا لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا () وَإِذَا أُلْقُوا مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا مُّقَرَّنِينَ دَعَوْا هُنَالِكَ ثُبُورًا}[1] واتە: کاتیک ڕۆژی دوایی کە ئاگر هەر لە شوێنێکی دورەوە ئەیان بینێ هێشتا نەچونەتە ناویەوە ئاگری دۆزەخ ئەکولێت و دەنگێکی زۆر بەهێزی هەیە و کاتێک بێ باوەرەکان فرێ ئەدرێنە ناوەوە بەدەست بەستراوییەوە لەجێگایەکی تەسک لەناو دۆزەخ.

ئینجا ئەڵێن: لەهۆش خۆی چوو لەگەڵی ماینەوە تاوەکو بەهۆش خۆی هاتەوە، دوایی بردمانەوە بۆماڵەوە، ئینجا هەموو ژیانی وا بەخوا پەرستی و دونیا نەویستی بردە سەر تاوەکوو مردن، وە کاتێک لەسەرە مەرگ بوو کچەکەی دەستی بەگریان کرد (رەبیع) فەرموی: کچەکەم بۆچی ئەگریت بەخوا ئێستا خێروچاکە ڕووی لە باوکت کرد) دوایی گیانی دەرچوو !!

ڕەحمەتی خوای گەورەت لێبێت (رەبیعی کوڕی خەیسوم) لەدونیا و ڕۆژی دوایی ئامین.

[1] - الفرقان ١٢-١٣

## وێنەی پێنجەم:
## عومەری کوڕی عبدالعزیز

موحەمەدی کوری عەلی کوری حوسێن، ئەیفەرموو:
ئایا نەتزانیوە هەموو گەلێک نەجیب زادیەکی هەیە، وە نەجیب زادەی بەنی ئومەییە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزە ئەو رۆژی زیندووبونەوە بە تەنیا دێت بەیەک گەڵ حیساب ئەکرێت؟؟
زۆر نەبوو تابیعی بەرێز ئەمیری باوەرداران (عومەری کوڕی عبدالعزیز) خۆڵی ئەتەکاند لە دەستی لەناشتنی خەلیفە (سولەیمانی کوڕی عبدالملەلیك) تاوەکوو گوێی لە زرمەیەك بوو گوتی: ئەمە چییە؟ گوتیان: ئەمە ئەسپ و سوارەکەیەتی بۆ ئەوەی تۆ لەسەری دابنیشی، ئەمە هی خەلیفەیە ئەویش بە لاچاوێکی تەماشای کرد،
گوتی: لای بەن پیرۆزی خۆتان بێت هێسترەکەی خۆم کوا بۆم بهێنن ئەمەم بەسە، جا خەریک بوو سواری پشتی هێسترەکە بێت بەرپرسی پۆلیس و کۆمەڵێک لەپۆلیس هاتن گوتی: چیتان ئەوێت؟
گوتیان: هاتوین بۆ ئەوەی ببین بەپاسەوان!
ئەویش گوتی: پێویستیم بە ئێوە نییە، بەڵکو منیش یەکێکم لە موسوڵمانان، دوایی بەرێکەوت بۆ مزگەوت لەگەل موسوڵمانان پاش سوپاس و ستایشی خوای گەورە و سەلاوات دان لەسەر پێغەمبەری

پێشەوا (ﷺ) گوتی: ئەی خەڵکینە خۆتان ئەزانن من بەخۆشی خۆم نەبومە بە پێشەوای ئیمانداران بەڵکو خۆتان منتان هەلبژاردوە و بەبێ ئەوەی من ئاگام لێبیت!

جا من ئەوە واز ئەهێنم لەبەر ئەوەی ئەرکێکی گەورەیە و ئەمانەتێکی گەورەیە بۆخوتان یەکێک هەلبژێرن.

ئینجا خەڵک بەیەک دەنگ هاواریان کرد نەخێر تۆمان ئەوێت تۆمان ئەوێت!

کاتێک بینی کەوا خەڵک رازین بەبوونی ئەو بەئەمیر دەستی بەقسە کردو گوتی: ئەی خەڵکینە لەخوا بترسن و گۆر هەیە و رۆژی زیندووبونەوە هەیە، وای بۆ باس کردن تاوەکوو دڵەکانیان جۆش و خرۆش کرد و چاوەکانیان پر بوو لە فرمێسك، ئینجا گوتی: ئەی خەڵکینە گوێرایەڵ بن تاوەکو من گوێرایەلی خوای گەورە بم و گوێرایەلی کەسێک ناکرێت ئەگەر لە فەرمای خوای گەورە دەرچێت.

دوایی بەرەوە ماڵەوە بەرێکەوت بۆ ئەوەی کەمێک پشوبدات، چونکە زۆرماندوو بوو لەناشتنی خەلیفە (سولەیمان) کە گەیشتەوە ماڵەوە خەریک بوو چاوی بکەوێتە خەووەوە، کوڕە نازدارەکەی (عەبدولمەلیك) کە تەمەنی حەڤدە ساڵ ئەبوو، گوتی: باوکە خەریکی چیت؟

گوتی: کوڕم زۆر ماندووم ئەمەوێت کەمێ پشوو بدەم پێش نوێژی نیوەڕۆ، ئینجا هەرچی حەق هەیە ئەمەوێت بیگەرێنمەوە بۆ خەڵک،

(عەبدولمەلیك) گوتی: باوکە گیان ئایە چ زامنە کەتۆ ئەگەیتە نوێژی نیوەڕۆ نامریت تاوەکو حەقی خەڵک بگەڕێنیتەوە؟!
ئینجا (عومەری کوڕی عبدالعزیز) لەگەڵ ئەم قسانەی کوڕەکەی خەو لە چاوانی زڕاو هێزێک لە گیانی دا جولاندی، گوتی: کوڕەکەم لێم نزیک بەرەوە، ئینجا نێوچەوانی ماچ کرد.
گوتی: سوپاس بۆ خوای گەورە کە لەنەوەی من یەکێک هەیە دەستگرم بێت بۆ راستیی.
ئینجا یەکسەر هەڵسا و ڕۆیشت بۆ مزگەوت بانگی خەڵکی دا، گوتی: هەر کەسێک ستەمی لێکراوە بابێت وەری بگرێتەوە.
ئینجا پێشەوا عومەری کوڕی عبدالعزیز (ڕەحمەتی الله تعالی لێبێت) هەر لە سەرەتای بوونیەوە بە خەلیفە فاطمەی ژنی بانگ دەکات و بەنەرمیی هەواڵێکی دەداتێ، کە تازە ئیتر ئەو مێردەکەی جاران نەماوە و کارێکی گەورەو کۆڵێکی قورس کەوتۆتە ئەستۆی، ئیتر ساتێک ماوەی نیە ئاوڕ لە ماڵ و منداڵی بداتەوە.
بەڵێ خەلیفە ئامادەیەو ئەوپەڕی سەربەستی بە ژن و کەنیزەکەکانی دەدات با بە ویست و سەربەستی خۆیان چارەنوسی خۆیان دیاری بکەن. فاطیمە دادەنیشێت یان بەدڵ و ویستی خۆیەتی و دەچێتەوە ماڵی باوکی ئەوا سەربەستە!
ئا لێرەدا هەڵوێستی ئافرەتی مەردو خواویست دەردەکەوێت کە بە جوانیی سەلماندی هەر خۆی شایانە کە خێزان و هاوسەری خەلیفەی

جوامێر و دونیانەویست بێت، بەڕاستی فاطیمە شایانە شان بەشانی خەلیفەی ئازیز ستایش بکرێت و شایانیشە هەمیشە تا دونیا ماوە ڕێزو ڕەحمەتی بۆ بنێررێت، کاتێک کە خەلیفە هەڵوێستەکەی خستە بەردەم فاطیمەی هاوسەری ئەویش دەستی بەگریان کرد.

کە ئەو دەستی بەگریان کرد، کەنیزەکەکانیشی دەستیان بەگریان شێوەن کرد.

گریانەکەش ئەوەی دەگەیاند کە ئەوان ئامادە نین بە هیچ شێوەیەک دەست لە خەلیفەی زاهید و خواناس هەڵ بگرن ئەوە بوو فاطیمە مەردانە، وەکو هاوسەرێکی کارامەو لێ هاتوو کۆمەک و پشتیوانی خەلیفە بوو و، هەمیشە پشتگیری لە هەنگاوەکانی دەکرد و، بۆ کۆسپ و گیرو گرفتیش چاک ترین داڵدەی بوو و بە چاکیی گوێی ئامۆژگاریەکانی دەگرت و کە دەش گریا ئەویش لەگەڵی دا دەگریا.

هەتا فاطیمە دەری دەخات کە عومەر لەماوەی خەلافەتی دا نە بۆ لەش گرانیی و نە بۆ ئیحتلام بوون خۆی نە شۆردووە!

هاوسەری دڵسۆزو خەم خۆری ترسی هەبوو کە ئەم کارە بۆ دینی خەلیفە زیانی هەبێت بۆیە بە ژیرانە ناردی بۆ لای پیاوێکی شارەزای شەرع و تێی گەیاند کە لەو کاتەوە بووەبە خەلیفە لە هاوسەری نزیک نەکەوتۆتەوە..

ئەو فەقیهەش کە چووە خزمەتی عومەر پێی گوت: ئەی ئەمیری ئیمانداران!

شتێکم پێ گەیشتووە کە دەترسم ڕێگات پێ نەدرێ بۆی!

پرسی ئەو شتە چیە؟

گوتی: هاوسەرەکەت مافی بەسەرتەوە هەیە.

خەلیفەش گوتی: جا کەسێک کە کاروباری ئوممەتی محمدی (ﷺ) لە گەردندا بێت و لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە لێی بپرسێتەوە، چۆن کاری وەهای پێ ئەنجام دەدرێت ؟

بەڵێ خەلیفەی دڵسۆز ماوەی کوا بچێتە لای هاوسەرەکەی، لە کاتێکدا کە موسڵمانان هی وایان هەبێت لەبرساندا، یان لەبەر نەخۆشیی، یان لێ قەومان، یان بەدەستی ستەم و ترس و لەرزەوە بناڵێنێ ؟!

بەم شێوە پیاوانی ئیسلام بۆ اللّٰه ژیاون و ئامادە بوونە واز لە هەموو خۆشی ڕابواردنی دونیا بێنن لە ترسی اللّٰه تعالی پاشان ئەرک و مافی موسوڵمانان،

ئەم پێشەوا جوامێرە ئەوەندە تەقوادار بووە موحەممەدی کوڕی کەعبی قەرەظیی کە یەکێک لە ڕاوێژکارەکانی بوو ئەڵێت: لەسەردەمی خەلافەتی عومەری کوڕی عبدولعەزیزدا هاتمە خزمەتی و منیش هەر سەرنجم دەدا.

گوتی: ئەی کوڕی کەعب!

بە شێوەک سەیرم دەکەی کە ئەوسا لە مەدینە وەها سەیرت نەدەکردم!

ئەڵێت: گوتم: بەڵێ، ئەی ئەمیری ئیمانداران !

سەرم سورِ دەمێنێ کە دەبینم وا لاشەت لاوازبووە و ، قژت درێژبووە و، ڕەنگت گۆڕاوە.

عومەر گوتی: ئەگەر دوای مردنم بە سێ ڕۆژ بم بینی کە لە هەردوو کونە لووتمەوە کرم هاتبێتەدەرێ و ئاوی چاوم بەسەر کوڵمم دا هاتبێتە خوارەوە ئەوکات زیاتر لێم سەرسام دەبیت!

پێشەوا سوفیانی ثەوری (ڕەحمەتی اللە تعالی لێبێت) دەفەرموێت:

ڕۆژێک پێشەوا عومەری کوڕی عبدالعزیز (ڕەحمەتی اللە تعالی لێبێت) بێ دەنگ بو لە مەجلیسێکا لەکاتێکدا هاوڕێکانی قسەیان دەکرد، پێیان فەرموو: ئەی پێشەوای موسوڵمانان ئەوە بۆ بێ دەنگیت و قسە ناکەیت؟!

ئەویش فەرمووی: خەیاڵم لای ئەوە بوو و بیرم لەوە دەکردەوە چۆن ئەهلی بەهەشت سەردانی یەکتری ئەکەن، وە چۆن ئەهلی ئاگریش هاوار و ناڵەیانە لەتاو سزا و ئیتر دەستی بەگریان کرد.

تۆش لە خۆت بپرسە و بزانە ڕۆژانە خەیاڵەکانت بۆ چین..؟

سبحان اللە ماڵی دونیا و خۆشیەکانی هاتەنە ناو دەستیان کەچی ئەوان پشتیان لێکرد و ڕوویان لە قیامەت و دوارۆژی نەبڕاوە کرد...

ئینجا پێشەوا عومەری کوڕی عبدالعزیز (ڕەحمەتی اللەی لێبێت) ڕۆژێکیان دەستی بەگریان کرد.

پێی گوترا: بۆ چ دەگریت؟

گوتی: کە بگریم گلەیم لێ دەکەیت؟

بە خوا ئەگەر بەرخێکی تازە لەدایک بوو لەسەر ڕۆخی فوڕات تیا بچێت ڕۆژی قیامەت تۆڵەی لە عومەر دەسێنرێت.

سبحان اللە پشەوای ئیمانداران خەمی بەرخێکی بووە چ جای گیانی موسوڵمانێک، ئێستاش بەڕاستی ئوممەتی ئیسلام کەوتۆتە کەند و قوڵایەکی زۆر سەخت لە نەبوونی پێشەوایانی سەر ڕاست و خەمخۆری ئیسلام و موسوڵمانان یاری بە خوێن و گیانی ئیمانداران دەکرێت، بەڕاستی سەختە بەڕاستی..

بەڕاستی پێشەوا عومەر(ڕەحمەتی اللە تعالی لێبێت) لەسەر قورئان و سوننەت زۆر سووربوون...!

هەر بۆیە لە بارەی بەڕێوەبردنی ئەم ئومەتە فەرموویەتی: بەلامەوە خۆشترە یەکەم کەس بمرم، نەک ئەم ئوممەتە بە غەیری قورئان و سوننەت بەڕێوەببەم، چونکە ئەمە بوو ئێمەی بەرز کردەوە لە کاتێکدا پێشتر هیچ نەبوین.

بەڵێ پێشەوا عومەری کوڕی عبدالعزیز (ڕەحمەتی اللەی لێبێت) خۆشی دونیای کردبوویە قوربانی قیامەت و هەمیشە ئامۆژگاری موسوڵمانانی ئەکرد و ئەیفەرموو:

لە خۆبایی مەبن بە خۆشی و هەڵاو بەزمی دونیا..!
ئەی ئەو کەسەی دەبیتە دانیشتوی گۆڕ
چی تۆی لە دونیادا لە خۆبایی کرد ؟!
کوا ماڵە فراوانەکەت کوا ڕوبارە ڕێکردوەکەت..؟
کوا بەروبومە پێگەیشتوەکەت.؟!
کوا جلوبەرگە ناسکەکانت.؟!
کوا جوانی و بۆنە خۆشەکانت وە جلوبەرگی هاوین و زستانت ؟! .
ڕەحمەتی الله تعالی لە پێشەوا عومەر و سەرجەم ڕێبوارانی ڕێگای ئیسلام و یەکخواپەرستی بێت...

## وێنەی شەشەم:
## عەبدولمەلیکی کوڕی عومەری کوڕی عبدالعزیز

با بزانین ئەم کوڕە کێیە کە خەڵک گووتیان: کوڕەکە باوکی خستە نێو عیبادەتەوە؟

بەیەکەوە بچینە خزمەتی و بەسەرهاتی ئەم گەنجە بزانین چیە؟

(عومەری کوڕی عبدالعزیز) پازدە مندالی هەبوو!

سێیان لەوانە کچ بوون هەموویان بەشی خۆیان نەجیب زادەو لە خواترس بوون، بەڵام ناوەندەکەیان کەناوی (عەبدولمەلیك) بوو لە هەموویان خواپەرستتربوو ئەقلی پیاوی گەورەی هەبوو، زیاتر لە هەموویان لەخوا ئەترسا و زۆر لە عبداللّٰەی کوڕی پێشەوا عومەر ئەچوو (ڕەزای اللە تعالی لێبێت)

ئەوەتا کوڕی مامەی (عاسم) ئەفەرموێت: جارێکیان هاتم بۆ شاری (دیمەشق) بۆ سەردانی ماڵی مامەم ئەلێت: شەو کە تاریک بوو هەر کەسەو چوینە سەر جێگای خۆمان بۆ خەوتن، دوایی (عەبدولمەلیك) کە زانی من خەوم لێکەوت، هەلسا هێدی هێدی چراکەی کوژاندەوە بۆ ئەوەی من هەستی پێ نەکەم چی ئەکات!

دوای من خەوم لێکەوت کەنیوەی شەوە بەخەبەرهاتم بینیم (عەبدولمەلیك) نوێژی ئەکرد!

ئینجا ئەم ئایەتەی ئەخوێندەوە کە خوای گەورە ئەفەرموێت: {أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ} واتە: ئایا ئەوانە پەلەیانە زوو سزای ئێمە یەخەیان بگرێت؟!

{أَفَرَأَيْتَ إِن مَّتَّعْنَاهُمْ سِنِينَ} واتە: باشە ئایا ئەگەر ساڵەها مۆڵەتیان بدەین و ژیانی دنیا بەخۆشی ببەنە سەر، باوەڕ دەهێنن؟!

{ثُمَّ جَاءَهُم مَّا كَانُوا يُوعَدُونَ}[1]واتە: پاشان ئەگەر ئەو هەڕەشە و سزایەی کە لەوان کراوە هاتە دی و پێش هات، دەتوانن چی بکەن؟!

ئەم ئایەتەی ئەخوێند و هەنیسکی زۆر بەتوندی ئەداوە لەگەڵی ئەگریا و فرمێسکی ئەهاتەخوارەوە!

ئەڵێ منیش گوتم: ئێستا نا ئێساتا دڵی دێتە دەرەوە لە بەرگریانیی!

دوایی منیش گوتم: (سبحان الله والحمد لله ) ئینجا ئەم خۆی بێ دەنگ کرد وەک بڵێی هیچ نەبووە. ئینجا (عەبدولمەلیك) ئەم پیاو چاکە خەریکی داواکردنی زانیاری شەرعیی بوو، ئەوەندە خەریکی زانیاری بوو تاوەکو بووە یەکێک لە (زاناکانی) سەردەمی خۆی،

ئەوەتا جارێکیان (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) هەموو زاناکانی کۆکردەوە سەبارەت بە دانەوەی ئەو حەقانەی کە لە خەڵکیان سەندرابوو بە زۆر، لەسەردەمی خەلیفەکانی ئومەوی، بۆیە گوتی: چی

---

[1] - سورەتی (الشعرا_ئایەتی ٢٠٤ -٢٠٦)

بکەم ئینجا زاناکان گوتیان: ئەمە لە سەردەمی پێشی تۆ بووە، تۆ هیچ گوناهێکت نییە (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) دڵی ئاوی نەخواردەوە بەم فەتوایە، گوتی: چی بکەم؟!

یەکێک لەزاناکان گوتی: بانگی (عەبدولمەلیك) بکەن!

بانگیان کرد، کەبانگیان کرد (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) گوتی: ئەی (عەبدولمەلیك) تۆ چی ئەڵێیت سەبارەت بەوەی ئەم حەقانەی کە پێش ئێمە لەسەردەمی خەلیفەکان لە خەڵکی سەندرابوو بە زۆر؟

(عەبدولمەلیك) گوتی: من وائەبینم بیاندەیتەوە مادام تۆ هێزت هەیە و ئەم خەڵکە ماون لەژیان، ئنجا (عومەری کوری عەبدولعەزیز) دڵی ئاوی خواردەوە بەم قسانە!

هەموو حەقەکانی گەراندەوە بۆ خاونەکانی.

لەگەڵ لە خواترسانی (عەبدولمەلیك) بەڵام باوکی (عومەری کوڕی عبدالعزیز) بەردەوام ئامۆژگاری ئەکردو بەیادی ئەهێنایەوە،

ئەوەتا دەستە راستی (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) (مەیمونی کوڕی مەهران) ئەفەرمووێت: جارێکیان چوومە ژورەوە بۆ لای (عومەری کوری عبدالعزیز) پەرەیەکی لەدەست بوو ئەی نووسی بۆ کوڕەکەی:

(کوڕی شیرینم ئەزانم کە تۆ زۆر سەر ڕاستی و تێم ئەگەی من چی ئەڵێم، وە سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە ئەو لە گەورەترین شتی تا بچوکترین شتی، کوڕی شیرینم بزانە چاکەی خوای گەورە لەسەر باوکت و دایکت زۆرە، و کوڕی شیرینم ئاگات لەخۆت بێت لە فیزوخۆ بەزل

زانین چونکە کردوەی شەیتانە وە ئەو دوژمنی هەرە گەورەی باوەڕدارانە، وە بزانە من کە ئەم شتانەت بۆ ئەنووسم هیچ شتێکی خراپم لە تۆ نەزانیوە تەنها باشە نەبێت، بەڵام من هەست ئەکەم کەمێک لەخۆت بای بویت) ئینجا (مەیمون) ئەفەرمووێت: (عومەری کوڕی عبدالعزیز) گوتی: ئەی (مەیمون) من لەخۆم ئەترسم خۆشەویستی ئەم کوڕە خراپەکانی لەبەر چاوانم نەبێت برۆ بۆ لای بزانە کاری چییە!

چونکە ئەم مێرد منداڵە زۆری لێ ئەترسم شەیتان هەڵی بخەلەتێنێ!!

ئینجا (مەیمون) ئەفەرمووێت: منیش ڕۆیشتم بۆ لای کە گەیشتم بینیم گەنجێکی زۆر جوان و دەم چاو ڕووناک لەسەر فەرشێکی موو دانیشتبوو سلاوم کرد، وەلامی دامەوە زۆر بە ئەدەبەوە زۆر خۆی بەکەم پیشان ئەدا.

(عەبدولمەلیك) فەرمووی: بیستومە لە باوکمەوە ئەی (مەیمون) کە تۆ پیاوێکی باش و چاکی، جا توخوا ئامۆژگاری خێرم بکە و هیوادارم تۆ یەکێک بیت لەوان.

(مەیمون) گوتی: چۆن خۆت ئەبینیت؟

(عەبدولمەلیك) گوتی: سپاس بۆ اللە لە گەوریی ئەو باشم، بەلام ئەترسم گومانی باشی باوکم زۆر بێت کەچی منیش وا نەبم و من ئەترسم کەوا خۆشەویستی ئەو بۆ من منی لەیاد کردبێت!

(مەیمون) ئەلێ منیش سەرم سورما لە باوک و کوڕکەی کە قسەیان کرد (مەیمون) ئەی سەرچاوەی بژێوت لەکوێیە؟؟

(عەبدوڵمەلیك) لە پارچە ئەرزێک لە کابرایەکم کڕیوە بە پاریەک کە فلسێکی حەرامی تێدا نییە، و من ئەم پارەیەی کە لەجەنگ وجیهادا دەست ئەکەوێت هیچی وەرناگرم .

(مەیمون) ئەی خواردنت چییە؟

(عەبدوڵمەلیك) شەوێک (گۆشت) و شەوێک (نیسک و ڕۆن) و شەوێک (خەل و ڕۆن) !!!!

(مەیمون) باشە هیچ فیزو تەکبورت نییە؟

(عەبدوڵمەلیك) بەڵێ شتیکی وا هەبوو لە ناخمدا بەلام کاتێک باوکم ئامۆژگاری کردم چاکی کردمەوە وە دونیای لەبەرچاوم دا بێ نرخ کرد خوای گەورە پاداشتی خێری باوکایەتی بداتەوە .

(مەیمونی کوری مەهران) ئەفەرمووێت: کاتێکی زۆر لەگەڵ ئەم مێرد منداڵە دانیشتم ئەگەرچی تەمەنی بچوک بوو بەڵام ئەقڵێکی گەورەی هەبوو ئەدەبیکی جوان، کاتیک کۆتایی نیوەڕۆ هات گەنجێک هات، گوتی: تەواو بوو؟

(مەیمونی کوری مەهران) گوتی: لەچی کارێک تەواو بوون؟؟

(عەبدوڵمەلیك) مەبەستی (حەمام) بوو .

(مەیمون) چۆن ؟

(عەبدوڵمەلیك) خەڵکیان کردە دەرەوە .

(مەیمون) کوڕی شیرینم پێش ئێستا زۆر لەبەرچاوم گەورە بویت بەڵام ئێستا نازانم بۆ کەمێ دڵم لێت دوو دڵە!!

(عەبدولمەلیك) زۆر ترسا گوتی: بۆ مامەگیان (انا للّٰه انا الیه راجعون) بۆچی بووە مامە گیان ؟؟

(مەیمون) حەمام بۆ تۆ تەنها چۆڵ ئەکرێت؟؟

(عەبدولمەلیك) گوتی: نەخێر .

(مەیمون) ئەی بۆچی خەڵک ئەکەیتە دەرەوە؟

ئەتەوێت جیا بیت لەخەڵکەوە؟

فیزو تەکەببور ئەکەیت؟

دوایی ئەزیەتی خاوەن حەمامەکە ئەدەیەت؟

(عەبدولمەلیك) خاوەن حەمامەکە من کرێیەکی زیادی ئەدەمێ .

(مەیمون) ئەی باشە ناترسیت ئەم پارە زیادەیەی کە ئەیدەیت زێدە مەسروفە و لە فیزو تەکبورە؟

دوایی بۆچی لەگەڵ خەڵک ناچیتە حەمامەوە تۆش وەک ئەوان نیت؟

(عەبدولمەلیك) ئەزانی من بۆ ناچم بۆ حەمام لەگەڵ خەڵک؟

چونکە خەڵکێکی گێل دێن بۆ حەمام بە ڕوتی هیچ جلیان لەبەر نییە وە منیش پێم ناخۆشە بەزۆری جلیان لەبەر بکەم دوایی لێم بترسێن وا بزانن من بە دەسەلاتەکەم زۆریان لێ ئەکەم، بۆیە من نامەوێت (عەورەتیان) ببینم بەتەنیا ئەچم بۆ حەمام، مامە گیان ئامۆژگاریم بکە! و ڕێگایەکم پێ نیشان بدە تا لەم شتە رزگارم ببێت؟

(مەیمون) راوەستە تاوەکوو شەو خەڵک هەموی ئەچێتەوە بۆماڵەوە ئینجا تۆ برۆ بۆ حەمام .

(عەبدولمەلیك) باشە پەیمان بێت جارێکی تر واناکەم، وە بەڕۆژ ناچم بۆ حەمام وە ئەگەر ساردی ئەم ولاتانە نەبێت هەر نەئەچوم بۆ حەمام. دوایی کەمێ سەری لەقاند و گوتی: توخوا مامە گیان ئەم شتە لە باوکم بشارەوە من ئەترسم لێم زویربێت و ئەجەل نەهێلێت بیبینمەوە جارێکی تر گەردەنی خۆمی پێ ئازاد بکەم .

(مەیمون) باشە ئەگەر ئەمیری باوەرداران پێی گوتم: چیت بینی پێت خۆشە درۆ بکەم؟!

(عەبدولمەلیك) نا استغفرالله بەڵام ئەگەر پرسی لەبارەی منەوە بڵێ شتێکی لە دڵ گەورە ببو دوایی من ئامۆژگاریم کردو ئەویش وازی لێ هێنا

(مەیمون کوڕی مەهران) ڕەحمەتی خوا لەم کوڕ و باوکە بێت هیچ نەم بینیوە کوڕ و باوکێک ئاوا بن رەحمەتی خوای گەورە لێیان بێت .

# وێنەی حەوتەم:
# شورەیحی قازی

سوفیانی ئەوسی ئەلێت: بەشورەیحی قازیان گوت:
بە چ شتێک ئەم زانستەت بەدەست هێناوە؟؟ ..
ئەویش گوتی: بە دانیشتن لەگەڵ زانایان لێیان وەرئەگرم و ئەیان دەم پێیان.
پێشەوا عومەری کوری خەتاب (ڕەزای الله تعالی لێبیت) وڵاخێکی لە کابرایەک کڕی و پارەکەی بە نەقد دا بەکابرا دوای سواری پشتی بوو ڕۆیشت زۆر نەڕویشت وڵاخەکە راوەستا و نەیتوانی بڕوات، ئینجا خەلیفە عومەری کوری خەتاب (ڕەزای الله تعالی لێبیت) هاتەوە لای کابرا گوتی: فەرموو وڵاخەکەت بگرە، چونکە ناڕوات!
کابرا گوتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران من کاتێک ئەم وڵاخەم پێ فرۆشتی ساغ بوو هیچ عەیبی نەبوو .
عومەری کوری خەتاب (ڕەزای الله تعالی لێبیت) یەکێک دا بنێ لە نێوان خۆم و خۆت .
کابرا گوتی: شوریەحی کوری حارسی کیندی دەبێتە داد وەر لە نێوانمان.
کاتیک ڕووداوەکەیان بۆ قازی شورەیح گێراویەوە .

شورەیحی قازی: ئەمیری ئیمانداران ئایا ساغ و سەلامەت بوو کە لەم کابرایەت کڕی؟

عومەری کوری خەتاب (ڕەزای الله تعالی لێبیت): بەڵێ.

شورەیحی قازی: یان بیگەڕێنەوە بەساغی یان وا بۆ خۆت بێت!

ئینجا ئایا دادوەری وایە؟! قسەیەکی جیاکەرەوە و دادوەریەکی راست و دروست، عومەری کوری خەتاب (ڕەزای الله تعالی لێبیت): پێی فەرموو: برۆ بۆ شاری کوفە من تۆم کردە دادوەر.

پێش ئەوەی عومەری کوری خەتاب (شورەیحی قازی) هەڵبژێرێت بۆ دادوەری ئەوا ئەم دادوەرە بەرێزە وە نەبێت کەس نەی ناسیبێت، بەڵکو زۆر بەناوبانگ بوو بەزیرەکی و خەڵک سەرسام ببوو بەسەلیقەیی ئەم کابرایە، بۆچی نا ئەم کابرایە خەڵکی ولاتی (یەمەنە) و (کیندیە) کەمێک لە ژیانی خۆی لە نەفامیەتی بردە سەر و زۆر حەزی ئەکرد کەوا بێتە خزمەتی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) بەلام نەبوو بەقسمەتی، ئەوەبوو چوویە خزمەتی هاوەڵە بەرێزەکان، وە کاتێک پێشەوا عومەری کوری خەتاب (ڕەزای الله تعالی لێبیت) کە کردیە دادوەر نەوەک نەیزانی بێت هەڵیبژێرێت، بەڵکو کاتێک هەڵیبژارد چەندین هاوەڵی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) لە ژیان مابوون، بەڵام ئەوی هەڵبژارد، چونکە (شورەیحی قازی) بۆماوەی شەست دانە ساڵ دادوەری کرد وە هەموو خەلیفەکان لەدوای عومەر (ڕەزای الله تعالی لێبیت) هەر لە شوێنی قەزاوەتیان دانا لەوانە (عومەر، عوسمان، عەلی، موعاویە ) (ڕەزای الله تعالی یان لێبێت).

هەر وەکو لەپاش ئەوانیش خەلیفەکانی ئومەویەکان دایان ناوە بە (دادوەر-قازی) کاتێک تەمەنی گەیشتە سەد و حەوت (١٠٧) ساڵ داوای کرد کە واز بهێنێت لە دادوەری، بەڵام نەیان هێشت، پەرتوکەکانی مێژوو پڕە لەبەسەرهاتەکانی ئەم تابعیە بەرێزە لەوانە (عەلی کوڕی ئەبو تالب) کاتێک قەڵغانەکەی (خۆپارێز) لە ڵای کابرایەک دیتەوە (ئەهلی زیمە) بوو ئەوانەی کە موسوڵمان نین لە وڵاتی موسوڵمانان ئەژین لەشاری (کوفە) لە بازارەکەی ئەی فرۆشت کە بینیەوە ناسیەوە، گوتی: بە کابرای (زیمە) بمدەرەوە ئەمە هی منە لە فلانە شەو لێم کەوت لە فلانە جێگا.

کابرا گوتی: هی خۆمە ئەی ئەمیری موسوڵمانان ئەبینیت لەدەستمە .

عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ڕەزای اللە تعالی لێبیت): نەفرۆشتومە و نەداومە بەکەس چۆن دەستت کەوتوە؟!

کابرا گوتی: نێوان من و تۆ دادوەری موسوڵمانان هەیە .

کاتێک هاتنە بەر دەستی دادوەری موسوڵمانان (شورەیحی قازی) بە عەلی کوڕی ئەبو تالیبی (ڕەزای اللە تعالی لێبیت) گوت:

(شورەیحی قازی) : چی ئەلێت ئەی پێشەوای باوەڕداران؟

عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ڕەزای اللە تعالی لێبیت): من ئەم پارێزەرەم لە لای ئەم کابرایە دیتەوە نە بە دیاری داومە بەکەس نە فرۆشتومە، چۆن کەوتە دەستی؟!

(شورەیحی قازی) : ئەی کابرا تۆ ئەڵێیت چی؟!

کابرا گوتی: ئەم پارێزەرە هی منە و لەدەستمە و من پێشەوای باوەرداران بە درۆ ناخەمەوە .

(شورەیحی قازی): ڕووی کردە عەلی کوڕی ئەبوتالیب، گوتی: هیچ دوو دڵ نیم کەوا تۆ ڕاست گۆیت: بەڵام ئەبێت دوو شاهیدت هەبێت .

عەلی کوڕی ئەبوتالیب: بەڵێ هەمە دوو شاهید خزمەتکارەکەم و حەسەنی کوڕم .

(شورەیحی قازی): بەڵێ ڕاستە، بەلام شاهیدی کوڕ بۆ باوک ناشێت و من قبوڵی ناکەم .

عەلی کوڕی ئەبوتالیب: سبحان الله پیاوێک لە ئەهلی بەهەشتە شاهیدی لێ وەرناگیرێت؟!

ئایا گوێت لە پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) نەبوە کە ئەفەرمووێت: (حەسەن و حوسێن گەورەی گەنجانی بەهەشتن)؟!

(شورەیحی قازی): ئەزانم، بەڵام من شاهیدی کوڕ بۆ باوک وەرناگرم .

عەلی کوڕی ئەبوتالیب: ڕووی کردە کابرای ئەهلی زیمە و گوتی: هیچ شاهیدی ترم نیە بیگرە .

کابرا گوتی: بەڵام من شاهیدی ئەدەم کەوا ئەم پارێزەرە هی تۆیە ئەی پێشەوایی باوەڕداران، لەبەرامبەر دادوەر ئەوەستێ و دوای دادوەر حەق ئەدات بەمن؟!

من شاهیدی ئەدەم کە ئەم ئیسلامە ڕاستە و هەروها من شاهیدی ئەدەم کە **(آشهد ان لا اله الا الله وان محمد رسول الله)** و بزانە ئەی

دادوەر ئەم پارێزەرە هی پێشەوای باوەڕدارانە لەکاتێک کەئەرۆیشت بۆ شەری (صفین) لە وشترەکەی کەوت منیش هەڵم گرتەوە.

عەلی کوڕی ئەبو تالیب: چونکە تۆ بویتە موسوڵمان ئەوا منیش دام بەتۆ و ئەم وڵاخەشم دا بە تۆ بە دیاری، زۆری نەبرد ئەم کابرایە لە شەری (نەهەرەوان) کە پێشەوا عەلی کوڕی ئەبوتالیب (ڕەزای الله تعالی لێبیت) دژی (خەواریجەکان) کردی ئەو شەهید بوو.

بەسەرهاتەکان زۆرن یەکێکی تر لەو ڕووداوە جارێکیان کوڕەکەی (شورەیحی قازی) کەمێک کێشەی لەگەڵ چەند کەسێک هەبوو گوتی: باوکە گیان بانگیان بکەم بۆ ئەوەی دادوەری بکەیت لەگەڵیان، کاتیک بانگیانیانی کرد حەقەکەی دا بەخەڵکەکە، کاتێک گەڕانەوە بۆ ماڵەوە گوتی: باوکە گیان ئابڕوت بردم !!

(شورەیحی قازی): کوڕی خۆم بەخوا تۆ خۆشەویست تری لەوان، بەڵام خوای گەورە خۆشەویستترە لە تۆ ترسام یەکەم جار پێت بڵێم کەوا حەق لە لای ئەوانە بچیت سولحیان لەگەڵ بکەیت و حەقەکەیان بفەوتێت.

جارێکی تر کوڕەکەی (شورەیحی قازی) بوە کەفیلی یەکێک دوایی کابرا هەڵات ئینجا کوڕی (شورەیحی قازی) یان گرت و بردیانە بەندیخانە (شورەیحی قازی) هەموو رۆژێک خواردنی بەخۆی بۆی ئەبرد.

وە زۆر جار (شورەیحی قازی) دوو دڵ ئەبوو لە وەرگرتنی شاهیدەکان، بەلام ناچار بوو لەوەرگرتنی بۆیە پێیانی ئەگوت بە شاهیدەکان گوێ

بگرن: خوای گەورە ڕێنمونیتان بکات، ئێوە دادوەرن بەسەر ئەم خەڵکە من نیم ......

وە من خۆم ئەپارێزم لە ئاگر بەئێوە، بەڵکو ئێوە یەکەم ترن بە پاراستنتان لە ئاگر ......

ئێستا ئەتوانن شاهیدی نەدەن و بڕۆن.....

ئەگەر هەر بەردەوام بان لەسەر شاهیدی دان ....

تەماشای ئەکردن و ئەیگوت: گوی بگرە ئەزانم تۆ(ستەم کاری)، بەڵام من فەرمان نادەم تەنها بە گومان، بەڵکو فەرمان ئەدەم شاهیدی شاهیدەکان وە ئەم دادوەریەی من هیچ حەلالێکت بۆ حەرام ناکات .

(شورەیحی قازی)ی ئەم قسانەی زۆر دووبارە ئەکردەوە لە کاتێک دادوەری ئەکرد، بەیانی ستەم کار ئەزانرێ لە خەسارەتمەندار؟

ستەم کار چاوەڕوانی پاداشتەکەی ئەکاتەوە، ستەم لێ کراو چاوەڕوانی ئەوەیە کە حەقی خۆی بۆ بسێندرێتەوە، وە من سوێند ئەخۆم بە خوای گەورە هەر کەسێک شتێک لەپێناوی خوای گەورە واز لێ بهێنێت ئەوا هەست بە نەبوونی ئەوشتە ناکات ....

(شورەیحی قازی) ئامۆژگاری خەڵکی ئەکرد ئەوەتا جارێکیان کابرایەک کێشەی هەبوو زۆر دڵگران بوو هەر باسی ئەکرد و گڵەیی ئەکرد ...

(شورەیحی قازی) دەستی گرت و بردی بۆ لایەک گوتی: کوڕی برام ئاگات لە خۆت بێت گڵەیی کێشەکانت بۆ کەس باس مەکە تەنها بۆ خوای گەورە نەبێت، لە بەر ئەوەی گڵەیی بۆ ئەکەی یان برادەرە یان دوژمن

ئەگەر برادەربووە ئەوا دڵی ناخۆش ئەکەی وە دڵگران ئەبێت وە ئەگەر دوژمن بوو ئەوا دڵی پێ خۆش ئەبێت و شادە .......

سەیربکە ئەم چاوەی من ئەبینێت؟ ئەمە سوێند بەخوا پازدە ساڵە نە کەسێکم پێ بینیوە نە ڕێگایەک، وە کەسیش نەی زانیوە تەنها تۆ نەبێت ئایا گوێت لەبەندە چاکەکەی خوا نەبووە کە ئەڵێت:

**(إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللَّهِ)**[1] واتە: بەڕاستی من باسی سکاڵا و غەم و پەژارەم هەر بۆ لای خوا دەبەم.

برادەرێکی جارێکیان لە شاری کوفە نەخۆشی (تاعون) تێدا بوو هەڵات بۆ شاری نەجەف لەترسی ئەم نەخۆشیە ..

(شورەیحی قازی) نامەیەکی بۆ نارد و نووسی ئەی برای خۆم

(ئەو شوێنەی کە بەجێت هێشتوە نەمردنت بۆ نزیک ئەکاتەوە و نە ڕۆژکانت کە لەژیان ماوە لێ ئەسێنێتەوە ..

وە ئەم شوێنەی کە بۆی ڕۆیشتی ناتوانێ ڕێگر بێت لە ڕێگای ئەو خوایەی کە کەس قورتاری نابێت لە دەستی) .

هەزاران ڕەحمەتی الله تعالى لە (شورەیحی قازی) بێت و الله تعالى ئێمەش لەگەڵ ئەودا حەشر بکات.

---

[1] - ( ٨٦ ) یوسف

# وێنەی هەشتەم:

# حەسەنی بەسری

مەسلەمەی کوڕی عبدالملک، دەیفەرموو: چۆن گەلێک گومڕا ئەبێت کە پیاوێکی وەک حەسەنی بەسری تێدا بێت.

موژدەدەر هات و موژدەی دا بە خێزانی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) دایکی باوەڕداران (دایکی سەلەمە) (ڕەزای الله تعالی لێبیت) کە خزمەتکارەکەیان (خەیرە) کوڕێکی چاوگەش و جوانی بووە، دایکی باوەڕداران (دایکی سەلەمە) زۆر خۆشحال بوو، دەم و چاوی گەشایەوە وە ناردی بەدوایی (خەیرە) و کۆرپەڵەکەی تاوەکو لە ماڵی دایکی باوەڕداران کاتی پاش منداڵبوون ببەنە سەر، چونکە (خەیرە) زۆر خۆشەویست بوو لە لای دایکی باوەڕداران چەند کاتێکی پێ چوو تاوەکو (خەیرە) و کۆرپەڵە چاو گەشەکەی هاتن بۆ لای دایکی باوەڕداران کە چاوی پێ کەوت بەم منداڵە چاوگەشە، چاوی پر بوو لە جوانی و میهرەبانی و هەندەی تر دڵی دایکی باوەڕداران گەشایەوە.

گوتی: ئەی (خەیرە) ناوت لێناوە؟

گوتی: نەخێر دام ناوە بۆ ئەوەی تۆ ناوی لێ بنێیت .

ئینجا دایکی باوەڕداران گوتی: بە بەرەکەتی الله تعالی ناوی ئەنێم (حەسەن) ئینجا دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و دوعای خێری بۆ کرد.

بەڵام خۆشەویستی (حەسەن) تەنها لە لایەن دایکی باوەڕداران نەبوو، بەڵکو لە ماڵی یەکێک لە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) کە ناوی (زەیدی کوڕی سابت) (ڕەزای الله تعالی لێبیت) کە (وەحی) بۆ پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) ئەنووسیەوە، چونکە باوکی (حەسەن) کە ناوی (یەسار) بوو خزمەت کاری ماڵی ئەم هاوەڵە بەڕێزەی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) بوو.

(حەسەنی بەسری) لە ماڵێک گەورە بوو کە ماڵی پێغەمبەری سەروەر (ﷺ) بوو لە لایەن دایکی باوەڕداران (دایکی سەلەمە) کەناوی (هند کچی سهیل) بوو، ئەم ئافرەتە یەکێک بوو لە خانەدانترین ئافرەتی مەککە کە لە کاتی پێش ئاینی ئیسلام توانیویەتی بخوێنیت و بنووسێت، وە ئەمە بووە هۆی گێڕانەوەی (٣٨٧) فەرموودەی پیرۆزی پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) کە زۆرترین فەرموودی گێڕاوەتەوە لە یەک کەس.

(حەسەنی بەسری) زۆر لەوە زیاتر خۆش بەختر بوو، چەند جار (خەیرە) ئەچوو بۆ بازار بۆشت کرین، کە ئەم کۆرپەڵە چاو گەشە ئەگریا (دایکی سەلەمە) شیری خۆی ئەدا بەم کۆرپەڵە چاو گەشە بۆ ئەوەی بێ دەنگ بێت و هێمن بێتەوە .

بۆیە (دایکی سەلەمە) لەدوو ڕوویەوە دایکی (حەسەنی بەسری) یە:

**رووی یەکەم:** بەو شێوەیەی کە دایکی باوەردارانە .

**رووی دووەم :** بەو شێوەیەی کە شیری پێ داوە .

(حەسەنی بەسری) لەم کەشوهەوایە گەورە بوو کە لە نێوان ماڵانی دایکی باوەڕداران و هاوەڵە بەرێزەکان تاوەکو (حەسەنی بەسری) گەورەبوو بووە گەنجێکی جوان و قەشەنگ، کە چەندین فەرموودەی گێراوەتەوە لە هاوەلانی بەرێزی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) لەوانە (عوسمانی کوڕی عەفان، عەلی کوڕی ئەبوتالیب، عبداللەی کوڕی عومەر، عبداللەی کوڕی عەبباس، ئەنەسی کوڕی مالیک، جابری کوڕی عبدالله و هی تر) لە هاوەڵە بەرێزەکان (ڕەزاو رحمەتی الله تعالی یان لێبێت) بەڵام زۆر دڵی بە عەلی کوڕی ئەبو تالیب ئەبوویەوە تاوەکو لێی دوور و جیاواز نە ئەبوویەوە لە بەر ئەوەی ئەم هاوەڵە بەرێزە لە پاراوی زمانی و تەقواو لە خواترسانی و زانستی کە لە پێغەمبەری ئازیزی (ﷺ) وەرگرتبوو.

(حەسەنی بەسری) کەتەمەنی گەیشتە (چواردە ساڵ) لەگەڵ باوکی بەرێ کەوتن بۆشاری (بەسرە) بۆیە ناوبانگی دەرکرد لەدوایی بە (حەسەنی بەسری).

شاری (بەسرە) ئەوکات قەڵا و پێگەی موسوڵمانان بوو بۆ جیهاد کردن بۆیە شارەزابووە بە گەورە هاوەلانی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) و تابیعیە بەرێزەکان و ڕێزی وانە شەرعیەکان جمەی ئەهات لەناو مزگەوتەکان لەوانە رێزی هاوەڵی بەرێزی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) (عبداللەی کوڕی عەبباس) کە زانای ئەم ئوممەتەیە بە فەرموودەی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) حەسەنی بەسڕی لەم هاوەڵە بەرێزە زانستێکی زۆری لێ

وەرگرت لەوانە (تەفسیرو فقە و ئەدەب و زمانی عەرەبی و فەرموودەی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) ) تاوەکو (حەسەنی بەسری) بووە زانایەکی بەرێزی ئەم ئوممەتە ناوی (حەسەنی بەسڕی) لە شاراندا بڵاوبوویەوە .

ئەوەتا خەلیفەی باوەڕداران (مەسلەمەی کوڕی عەبدولمەلیك) پرسیاری کرد لە (خالیدی کوری سەفوان) گوتی: باسی (حەسەنی بەسری)م بۆ بکە چونکە تۆ لە هەموویان باشتر ئەیناسیت .

(خالیدی کوری سەفوان) دەیگوت: (حەسەنی بەسری) ناو دڵی وەک رووکەشی وایە قسەی وەک کردەوەی وایە ئەگەر فەرمانی بە کردەوەی چاک بکا ئەوا یەکەم کەسە کە خۆی فەرمان ئەکات بە چاکە و ئەگەر نەهی لە خراپە بکات ئەوا یەکەم کەسە کە نەهی لەخراپە ئەکات و من بینیم ماڵی دونیای نەئەویست ئینجا خەڵک داوایان لەو ئەکرد، ئینجا (مەسلمە) گوتی: (بەسە بەسە چۆن خەڵک گومرا ئەبێت پیاوێکی وای تیابێت)؟ !!

ئینجا کاتێک (حەجاجی کوری یوسفی سەقەفی) بوو بە دەسەڵاتدار لە وڵاتی عێراق کە چەند پیاوێکی ستەمکار بوو (حەسەنی بەسری) لە وانەبوو کە بەرەوە ڕووی راوەستا و دژایەتی زووڵم و ستەمەکانی کرد و تەنها لە اللہ تعالی ئەترسا .

جارێکیان (حەجاج) خانوێکی گەورەی دروست کرد و بانگی خەڵکی کرد بۆ ئەوەی بێن تەماشای بکەن (حەسەنی بەسری) ئەم دەرفەتەی قۆستەوە بۆ ئەوەی بچێت قسە بۆ خەڵکەکە بکات.

بۆیە چووە چوار دەورەی و سورایەوە، گوتی: تەماشامان کرد کە ئەم پیسی ناو پیسان مەبەستی حەجاج بوو کە ئەم کۆشك و ماڵەی دروست کردوە بەڵام نازانێ کە (فیرعەون) کۆشکێکی زۆر لەوی گەورەتر دروست کرد، دوایی الله تعالی فیرعەونی لەناو برد خۆزگە (حەجاج) ئەزانێت کە ئەهلی ئاسمان ڕقیان لێەتی و خەڵکی ئەرز ئەویان هەلخەڵەتاندوە.
تاوەکو یەکێک لە ئامادەبوان دڵی پێ سووتا، گوتی: بەسە ئەی باوکی سەعید بەسە .
(حەسەنی بەسری) فەرمووی: بە کابرا بەاللە بێ دەنگ نابم چونکە الله تعالی پەیمانی لە زانایان وەرگرتوە کە حەق بۆ خەڵک روون بکەنەوە و نەیشارنەوە .
دوای (حەجاج) بە پیاوانی خۆی گوت: ئەی بێ غیرەتینە بەندەیەک لە بەندەکان دێت ئاوا بە من ئەڵێت!!
ئێوەش رائەوەستن وەڵڵاهی ئەبێت خوێنی ئەوتان دەردخوارد بدەم!!
دوای گوتی: بە سەربرەکە خۆت ئامادە بکە و بە چەند پۆلیسێکی گوت: بڕۆن ئەم کابرایەم بۆ بهێنن!
کە (حەسەنی بەسری) یان هێنا بۆ لای (حەجاج) لێوی خۆی جولاند ئینجا حەجاج پێی گوت: فەرموو فەرموو ئەی باوکی سەعید لێرە دابنیشە لە شوێنی خۆی داینا ئینجا خەڵک زۆر پێیان سەیر بوو تا کەمێک پێش ئێستا حەجاج ئەوەندە توڕە بوو لە (حەسەنی بەسری) کە ئەی ویست خوێنی برژێنێ و بیدا بە پیاوانی خۆی ئەی بۆ ئێستا ئەوا نەرم بووە؟

ئینجا حەجاج پرسیاری لێ ئەکرد و(حەسەنی بەسری) وەڵامی ئەدایەوە تاوەکو تەواو بوو ئینجا، گوتی: بۆنی خۆش بهێنن دەستی بە بۆنی خۆش ئەکرد و لە ریشی (حەسەنی بەسری) ئەدا تاوەکو تەواو بوو دوای حەجاج گوتی: تۆ گەورەی زانایانی ئەی باوکی سەعید دوایی (حەسەنی بەسرِی) رۆیشت ئینجا جێگری حەجاج بەدوایی (حەسەنی بەسری) کەوت گوتی: ئەی باوکی سەعید پێش ئەوەی تۆ بێیت حەجاج ئەوەندە تورِە ببوو خوێن لە چاوانی ئەباری بەڵام من بینیم کەتۆ هاتیتە ژورەوە دەمت جولاند چیت گوت؟ !!

(حەسەنی بەسری) دەڵێ گوتم: **(اللهم يا ولى نعمتى و ملاذى عند كُربتى اجعل نقمته بردًا وسلامًا على، كما جعلت النار بردًا وسلامًا على إبراهيم)**

واتە: ئەی پەروردگارم خاوەنی نیعمەتەکانم هەر تۆی پەنام لە تەنگەنەکانم تۆرِەبون و تۆڵەسانەوەی سارد و سەلامەت کەی لەسەرم هەر وەکو ئاگرت سارد و سەلامەت کرد لەسەر پێغەمبەر ئیبراهیم.

زۆرن ئەو رووداوانەی کە تیایدا (حەسەنی بەسری) قسەی حەقی تێدا کردوە وە بەرووەروی دەسەڵاتداران بۆتەوە..

جارێکیان پاش ئەوەی ئەمیری باوەرِداران (عومەرِی کورِی عەبدولعەزیز) کۆچی دوایی کرد (یەزید) هاتە سەرتەختی دەسەڵات، ئەوەبو لایدا لە رێگای حەق و وەک ئەوەی پێشتر نە ئەبوو کاتێک بووە دەسەڵاتدار کەسێکی کردە دەسەڵاتدار لە عێراق بەناوی (عومەری کورِی هبیرە)

(یەزید) نوسراو لەدوو نوسراو ئەی نارد بۆ(عومەری کوڕی هەبیرە) کە تیایدا بۆی ئەنووسی توندبە لەگەڵ خەڵک و هەندێک جار برۆ با لەگەڵ حەقیش نەبیت.

بۆیە (عومەری کوڕی هەبیرە) بانگی هەردوو زانای کرد، واتە: (شەعەبی) و (حەسەنی بەسڕی) و تێی گەیاندن کە (یەزید) فەرمانی پێ ئەکات بە هەندێک جار بە خراپە ئایا لە ئایین دەر ئەچێت؟

زانا (شەعەبی) وەڵامێکی داوە تۆزێ نەرمی تێدابوو بۆ خەلیفە و سەرکردەی عێراق (عومەری کوڕی هەبیرە) و(حەسەنی بەسری) بێ دەنگ بوو .

(عومەری کوڕی هەبیرە): تۆچی ئەڵێیت ئەی باوکی سەعید؟

(حەسەنی بەسری) ئەی کوڕی هەبیرە لە الله بترسە بۆ یەزید، بەڵام مەترسە لە یەزید بۆ الله ، وە بزانە الله تعالی ئەتپارێزی لە یەزید، بەڵام یەزید ناتپارێزی لە الله تعالی، وە بزانە خەریکە فریشتەیەک بۆت دا ئەبەزێت لەسەر قەرەوێلەکەت لات ببات وە بتبات لە فراوانی قەسرەکەت بۆ تەنگی گۆڕەکەت ئینجا لە گۆڕەکەت (یەزید) نابینەوە بەڵکو ئەم کردەوانەت ئەبینیەوە کە سەرپێچی خوای (یەزید)ت پێ ئەکرد، ئەی کوڕی هەبیرە بزانە ئەگەر لە گوێرایەلی الله تعالی دابیت ئەوا ئەتپارێزێ لە خراپەی (یەزید) و ئەگەر لەگەڵ خراپەی (یەزید) دابیت ئەوا ئەتداتە دەست خراپەی یەزید، و بزانە نابێت گوێرایەلی هیچ کەسێک بکرێت مادام ئەم کەسە گوێرایەلی الله تعالی ناکات.

ئینجا (عومەری کوڕی هەبیرە) گریا و تا وەکو چاوەکانی پر لە فرمێسک بوو ئینجا چەندین دیاریدا بە (حەسەنی بەسری)، دوایی خۆی و زانا (شەعەبی) چوونەوە بۆ مزگەوت و خەڵک کۆبونەوە بۆ ئەوەی بزانن کەوا چییان گوتووە بە ئەمیری عیراق، زانا (شەعەبی) گوتی: خەڵکینە (هەر کەسێک ئەیەوێت خوای گەورە بەباشتر بزانێت لە سەر خەڵکی تر لە هەموو شوێنێک با بیکات سوێند بەو خوایەی کە روحی منی بەدەستە ئەم قسەیەی کە (حەسەنی بەسری) بە (عومەری کوڕی هەبیرەی) گوت: ئەم زانی بەڵام بەالله ویستم دڵی (عومەری کوڕی هەبیرە) رازی بکەم بەڵام (حەسەنی بەسری) ویستی خوای گەورە لەخۆی رازی بکات، بەڵام الله تعالى ئەوی لە (عومەری کوڕی هەبیرە) نزیک کردەوە منی دوور کردەوە (حەسەنی بەسری) نزیکەی هەشتا ساڵ ژیا بەڵام خەڵک هەر لە ئامۆژگاریەکانی دڵی نەرم ئەبوویەوە چاوەکانی پر ئەبوو لە فرمێسک ئەگەر گوێی لە ئامۆژگاریەکانی ئەبوو.

ئەوەتا کاتێک پرسیاریان لێ کرد لە بارەی دونیا ئەویش گوتی: پرسیارم لێ ئەکەی لە بارەی دونیا و ڕۆژی دوایی؟

نموونەی ژیانی دنیا و ڕۆژی دوایی وەک رۆژهەلات و رۆژ ئاوایە چەند تۆ لەلایەکیان دوور نزیک بکەویتەوە ئەوا لەوەی تریان دوور ئەکەویتەوە .

وە پێم ئەلێت پێناسەی دونیام بۆ بکە پێناسەی چیت بۆ بکەم دونیایەک سەرەتاکەی هەوڵدان و ماندوو بونەو کۆتایەکەی لەناو چوونە !!!

وە لە حەلاڵەکەی حیسابەو لە حەرامەکەی لێپێچینەوەیە.......

هەر کەسێک تیایدا دەوڵەمەند بوو ئەوا توشی تاقیکردنەوە بوو وە هەر کەسێک هەژار بوو ئەوا دڵ غەمگین و دڵ تەنگ ئەبێت ......

جارێکی دی پرسیاریان لێ کرد لە بارەی خۆی و خەڵک؟؟

گوتی: قورمان بەسەری چیمان لە خۆمان کرد؟!!

ئاینەکەمان بەکەم زانی و دونیامان بە باشتر زانی !!!

وە ڕەوشتمان لەدەست چوو جل و بەرگمان نوێ کردەوە یەکێک لە ئێمە لەسەر لای چەپ ئەخەوێت وە لەماڵی خەڵک ئەخوات.

خواردنەکەی بەدزی پەیدا کردوە ..

پارەکەی بە بێ ئیش کردن پەیدا کردوە .....

داوای شیرینی ئەکات پاش ترشی ....

داوای شتێکی گەرم ئەکات پاش شتێکی سارد ..

داوای شتێکی فێنک ئەکات پاش شتێکی وشک ....

تا وەکوو ورگی پڕ بوو لە خواردن سک ئێشە ئەگرێت ئینجا قرقێنە ئەداتەوە لە زۆر خواردن ...

دوای ئەلێ رۆلە شتێکم بۆ بهێنە تاوەکوو خواردن هەزم بکات ...

هەی گێلە تەنها دینەکەتە هەزم ئەکەیت، کوا دراوسێ نەدارەکەت؟؟؟؟

کوا هەتیوە برسیەکان؟؟؟

کوا هەژار و نەدارەکان؟؟؟

کوا ئەوەی کە اللە تعالی فەرمانی پێ کردی کە بیدەیەت بە بێ چارەکان؟؟

خۆزگە ئەتزانی تۆ ژمارەی ....

هەر کاتێک ڕۆژئاوا ئەبێت ئەوا ژماریەکت لێ کەم بۆوە ...

دوایی هەمووی ئەروات .. ئینجا لەشەوی هەینی ساڵی سەدو دەی کۆچی وەڵامی بانگی الله تعالی دایەوە کەبەیانی بوویەوە شاری بەسەرە هەژا لەگەڵ بڵاو بونەوەی کۆچی دوایی (حەسەنی بەسری).

ئینجا ئەمە یەکەم ڕۆژە لە مێژووی شاری بەسرە کە نوێژی (عەسر) نەکرێت بە جەماعەت لەبەر ئەوەی خەڵك چوو بۆ سەر قەبران بە دوای تەرمی (حەسەنی بەسری)دا.

هەزاران ڕەحمەت لە (حەسەنی بەسری) و سەرجم ئیمانداران بێت ئامین....

# وێنەی نۆییەم:

# ئەیاسی کوری موعاویەی موزەنی

پێشەوای باوەڕداران (عومەری کوڕی عبدالعزیز) شەو خەوی لێ زرابوو ئارەقەیەکی نەرمی کردبوو بیری جەنجاڵ ببوو لە یەکێک لە شەوە ساردەکانی شاری (دیمەشق) بیری ئەکردەوە (دادوەر_قازی) بۆ شاری (بەسرە) دابنێت، بەلام سەری سورما بوو کامەیان بکات بە قازی نەی ئەزانی کامەیان هەلبژێرێت تاکو بەڕاستی لە نێوان خەڵکدا فەرمان بکات، چاوی بریبوە دوو کەس کە هەردووکیان لە اللە ترس و دڵ پاک و سەر ڕاست بوون، بەیانی بانگی فەرمانڕەوای عێراقی کرد (عودەی کوڕی ئەرتا) پێی گوت: هەر دووکیان کۆبکەوە ئەیاسی کوری موعاویەی موزەنی و قاسمی کوری رەبیعە حارسی، فەرمووی: پێشەوای باوەڕداران (عومەری کوڕی عبدالعزیز) فەرمانی پێ کردووم کەوا یەکێکتان بکەم بە (دادوەر_قازی) لەشاری بەسرە ئێوە چی ئەڵێین؟

هەر یەکێکیان باسی ئەوی تری کرد بە چاکە .

(عودەی کوڕی ئەرتا): لەلای من ناچنە دەرەوە تاوکو یەکێکتان نەبن بە (دادوەر_قازی).

ئەیاس فەرمووی: ئەی پێشەوا پرسیاری هەر دووکمان لە دوو زانایی (عێراق) بکە (حەسەنی بەسری و محمدی کوری سیرین) بکە ئەوان لە

هەموو کەس باشتر ئەتوانن خەڵک بناسن کە بۆ ئەم پۆستە بشێت .
قاسمی کوڕی رەبیعە بەردەوام سەردانی ئەم دوو زانایەی ئەکرد و قاسمی کوڕی رەبیعە زانی ئیتر ئەیاس ویستی ئەم بارگرانیە لە کۆڵ خۆی بکاتەوە ئاوری دایەوە.
گوتی: ئەی پێشەوا.... پرسیار لە کەس مەکە سوێند بەو خوایەی کە هیچ خوایەکی تر نیە شایەنی پەرستن بێت (ئەیاس) زۆر لە من شارەزاترە لە ئاینی الله، وە زۆر شارەزاترە لە (دادگا)، ئەگەر من درۆ ئەکەم ئەوا نابێت کابرایەک کە درۆیەک ئەکات تۆ بیکەیت بە (دادوەر_قازی) وە ئەگەر من ڕاست بکەم ئەوا تۆ نابێت باشتر لە باشە پێش بخەیت ......
ئەیاس ڕووی کردە پێشەوای عێراق فەرمووی ....
تۆ کابرایەکت هێنا ویستت بیکەیت بە(دادوەر_قازی) وە داتنا لە لێوار دۆزەخ ئەویش ویستی خۆی رزگار بکات بە سوێندێکی درۆ دوایی بۆ خۆی تەوبە و ئیستغفار ئەکات وە خۆی رزگار کرد ..
ئینجا پێشەوای عێراق (عودەی کوڕی ئەرتا) گوتی: ئەوەی وا بیر بکاتەوە و بیر تیژ بێت و لە کارەکان بزانێت باشترە بۆ (دادوەر_قازی) ئینجا فەرمانی کرد کە تۆ بوویت بە (دادوەر_قازی) لە بەسرە .
ئینجا بزانین ئەم تابعینە بەڕێزە کێیە کەوا پێشەوای باوەڕداران (عومەری کوڕی عبدالعزیز) ویستی بیکات (دادوەر_قازی) لە شاری بەسرە؟
وە ئەم پیاوە جوامێرە کێیە کەوا بە نموونەی سەر ڕاست و بیر تیژ و تێگەیشتوو ئەیهێنەوە؟

ئەم کەسە کێیە کەوا بە نموونەی سەخاوەتی (حاتەمی تایی) دێتەوە؟
ئەم کەسە کێیە بە نموونەی نەرم و نیانی (ئەحنەفی کوری قەیس) دێتەوە؟
ئەم کەسە کێیە بە نموونەی جەربەزە و ئازایی (عەمری یەکروبی) دێتەوە؟

وەرن با پێکەوە ژیانی ئەم کەڵە پیاوە بزانین وە پەندی لێ وەربگرین ئەیاس کوری موعاویەی کوری قورەی موزەنی لە ساڵی چل و شەشی کۆچی لە ناوچەی (یەمامە) نەجد لە دایک بووە، دوایی کۆچیان کردووە بۆ شاری بەسرە لەگەڵ خێزانەکەی وە هەر لەوێ گەورە بووە و فێری زانستی ئیسلام بووە، جار بە جار سەردانی شاری (دیمەشق) ی ئەکردوو ئەوەی توانی زانیاری ئیسلامی لە هاوەڵانی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) کەمابوون لە ژیان و تابیعیەکان وەرگرت، وە هەر لە سەرەتایی مناڵیەوە نیشانەی زیرەکی و بلیمەتی ئەم گەنجە دەرکەوت، وە خەڵک وەک چیرۆک ئەیان گێرایەوە وە ناوی ئەم ئیمانداره بەرێزە چووە ناو هەموو ماڵێک ...

ئەگێرنەوە جارێکیان (ئەیاس) منداڵ بوو وانەی بیرکاری ئەخوێند لای کابرایەکی (جولەکە) کابرا دانیشتبوو لەگەڵ چەند برادەرێکی خۆی باسی موسوڵمانانی ئەکرد و ئەی گوت ...

کابرای جولەکە: موسوڵمانان ئەڵێین لەبەهەشتدا مرۆڤەکان ئەخۆن، بەڵام پاشەرۆکیان نیە؟؟؟

ئەیاس ڕووی تێکردن وە گوتی: روخسەت هەیە مامۆستا منیش قسەیەک بکەم لەم باریەوە؟

مامۆستا: بەڵێ فەرموو ..

ئەیاس: باشە ئایا هەموو شتێک کە لە دونیا ئەخورێت ئەبێت بە پاشەڕۆ؟؟

مامۆستا: نەخێر .

ئەیاس: باشە بۆ کوێ ئەروات ئەوەی ئەمێنێتەوە لە لەش؟

ماموستا: ئەروات بۆ خانەکانی لەش ..

ئەیاس: ئەی باشە بۆ ئێوە باوەڕ ناکەن کەوا لە بەهەشت هەمووی بڕواتە خانەکانی لەش و خۆراکی لەش؟!

مامۆستا: دەک خوا بتکۆژێت منداڵێکی چەند زیرەک و وریایت ....

ئەم گەنجە ڕۆژ بە ڕۆژ گەورەتر ئەبوو، بەڵام بیری زیاتر تیژتر ئەبوو .....

ئەگێرنەوە جارێکیان لە شاری دیمەشق لەگەڵ کابرایەک دەنگە دەنگی بوو حەقی لای ئەم کابرایە بوو، بەڵام کە نەگەیشتن بە یەکتری چوون بۆ لای (دادوەر- قازی).

ئەیاس: دەستی بە دەنگی بەرز کرد لە باسی هەقی خۆی بۆ دادوەر_ قازی.

(دادوەر-قازی): دەنگ بەرز مەکەرەوە ئەم کابرایە زۆر لە تۆ بەتەمەنترە.

ئەیاس: بەلام هەق زۆر لەو گەورەترە .

(دادوەر- قازی) : تورە بوو گوتی: بێ دەنگ بە ...

ئەیاس: گوتی: باشە کە من بێ دەنگ بووم کێ داوی هەقی من بکاتەوە؟؟

(دادوەر- قازی) : لەوەتەی هاتویتە ئێرە بۆ قەزاوەت تەنها تۆ ناهەقی ..
ئەیاس: لااله الا الله راستە یان نە؟
(دادوەر- قازی) : هێمن بویەوە گوتی ڕاستە سوێند بە خوای کەعبە .
ئەیاس بەردەوام بوو لە وەرگرتنی زانیاری ئیسلام ئەگەر چی هێشتا تازە پێگەیشتوو بوو، بەڵام ئەبوو بەپێشەوای پیاوە گەورەکان .
ئەوەتا جارێکیان (عبدالملک کوڕی مەروان) پێش ئەوەی ببێتە (پێشەوا) سەردانی شاری بەسرەی کرد، ئەیاسی بینی هێشتا (سمێل)ی بەتەوایی دەرنەکرد بوو، بینی پێش نوێژی بۆ چوار پیاوی ریش درێژ ئەکرد .
(عبدالملک کوڕی مەروان) گوتی: حەیف بۆ ئەم پیاوە ریش درێژانە کە ئەم منداڵە پێش نوێژیان بۆ ئەکات !
دوایی ڕوویی لەئەیاس کرد گوتی: تەمەنت چەندە ئەی منداڵ؟؟
ئەیاس: تەمەنی من لەتەمەنی (ئوسامەی کوری زەیدە) کە پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) کردی بە سەرۆکی هێزیک کە پیاوانی جوامێری وەک (ئەبوبەکر و عومەر) (ڕەزای الله تعالی یان لێبێت) تێدا بوو .
(عبدالملک کوڕی مەروان) گوتی: فەرموو فەرموو پێش کەوە ئەی گەنجەکە خوابتپارێزێت .
وە ئەگێرنەوە ساڵێکیان خەڵک چوونە دەرەوی شار بۆ ئەوەی مانگ ببینن تاوەکو بیکەن بە رەمەزان لەسەروی هەموویان هاوەڵی بەرێزی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) (ئەنەسی کوڕی مالک) (ڕەزای الله تعالی لێبێت) کە تەمەنی زۆر گەورە ببوو نزیکەی سەد ساڵ ئەبوو، کە تەماشایی

ئاسمانیان کرد مانگیان نەبینی، بەلام (ئەنەسی کوڕی مالک) گوتی: ئەوەتا مانگ من ئەیبینم، بەڵام کەس نەی ئەبینی، ئەیاس تەماشی کرد و زۆر بەئەدەبەوە (تالە موێکی) لەسەر چاو بوو کە زۆر درێژ بوو وای زانی ئەوە مانگە ئینجا ئیزنی لێ وەرگرت تالە مووکەی لا دا پێی گوت: ئەی ئێستا ئەی بینی ؟

گوتی: نەخێر نایبنیم نەخێر نایبنینم .

جارێکیان ئەگێرنەوە کابرایەک لە زیرەکەکانی ئەم سەردەمە لە یەکێک لە مەجلیسەکان دانیشتبوو گوتی: من پرسیارێکم هەیە؟؟

ئەی ئەیاس، گوتی: فەرموو .

کابرای سەرکردە: ئەی ئەیاس بۆچی (ئارەق) حەرامە؟

وە حەرامیەکەی لە کوێیە؟ تەنها ئاوی کوڵاوە و خورمایە بۆ حەرامە؟

ئەیاس: ئایا لە پرسیارەکەت بویتەوە؟

کابرای سەرکردە : بەلێ لێبومەوە .

ئەیاس: گووتی باشە ئەگەر من ناو لەپی دەستم پڕ بکەم لە ئاو وە بەدەموچاوی تۆی دابکەمە ئایا ئازارت ئەبێت؟!

کابرای سەرکردە: گوتی نەخێڕ .

ئەیاس: باشە ئەگەر دەسکێک لە (قسل) بەدەم وچاوی تۆی دا بکەم ئایا ئازاری ئەبێت؟

کابرای سەرکردە: گوی نەخێر .

ئەیاس: گوتی ئەی ئەگەر (قسل)ەکەم هێناوە خۆڵم بەسەردا کرد و کەمێک ئاوم بەسەریاندا کرد دوایی شێلام ئینجا دامنا لەبەر خۆر تاوکو وشک بۆوە وە رەق بوو ئایا ئەگەر لە دەم و چاوتی بدەم ئایا ئێشی هەیە

کابرای سەرکردە: بەڵێ لە وانەیە بمکوژێت .

ئەیاس: ئاوها ئارەقیش کاتێک خورما بە ئاوی گەرم تێکەل کرا و ماوەیەکی بەسەر چوو ئەوا ئەبێت بە ئارەق و حەرام ئەبێت .

نموونەی زۆری تر هەن کە ئەیاس لەکاتی (قەزاوەت) ڕووی داوە بۆ جارێکیان دوو پیاو هاتن بۆ لای ئەیاس یەکێکیان گوتی: گەورەم ئەم پیاوە من پارەم لە لای داناوە دوایی داوام لێ کردۆتەوە ئەڵێت شتی وا نییە تۆ پارەت لەلای من دانەناوە بوو بە مشت و مریان.

ئەیاس گوتی: هێی کابرا ئەم پارەیەی بدەرەوە کە لە لای تۆی داناوە ..

کابرای دز: نەخێر من نەم بردووە ئەگەر ڕاست ئەکات با شاهیدێک بهێنێت .

کابرای شکایەت کار: گەورەم من و ئەو لەژێر سێبەری دارێک لە فڵانە شوێنە دانیشتبوین، من پارەکەم دابەم کابرایە دوایی گوتم بمدەرەوە، گووتی پاری چی لای من نیە .

ئەیاس: فەرموو کابرا برۆ لای دارەکە بەڵکو بە یادت بێتەوە لە کوێت شاردۆتەوە .

ئەیاس: ئینجا ڕووی کردە خەڵکەی تر قسەی لەگەڵدا کردن بۆ ئەوەی کابرای دز کەمێ شتەکانی لە یاد بچێتەوە پاش کەمێکی تر کابرا خەیاڵی ڕۆیشتبوو .

ئەیاس: لەناکاو پێی گوت: ئەرێ کابرا ئایا ئەگەر بزانیت برادەرەکەت ئێستا گەیشتۆتە ئەودارەی کە لە ژێریادا دانیشتبوون؟!

کابرای دز: بەبێ بیرکردنەوە نەخێر زۆر دورە لێرە ..

ئەیاس: هەی دوژمنی خوا، ئەزانیت دارەکە لەکوێیە وە ئەڵێی من پارەی ئەم کابرایەم نەخواردوە؟!

ئینجا فەرمانی کرد بە حەپس کردنی و تاوکو کابرا گەرایەوە پارەکەی لێسەندەوە ..

وە نمونەی تر زۆرە، جارێکیان دوو کابرا هاتن یەکێکیان گوتی:

کابرای شکات کار: گەورەم ئەم پیاوە کاتێک من چومە ناو ئاوەوە خۆم بشۆم جلەکانم دانا لە لێوار حەوزەکە کە جلی من ڕەنگی سەوز بوو، دوای ئەم کابرایە هات جلەکانی دانا لە لێوار جلەکانی من جلەکانی ئەو ڕەنگی سوور بوو دوایی کە ئەو پێش من چوە دەرەوە جلە سەوزەکانی منی دەست دایە و بردی بەدوایی کەوتم، گوتم کابرا ئەمە جلی منە بمدەرەوە، بەڵام ئەو گوتی: جلی خۆمە .

ئەیاس: فەرمووی ها کابرا تۆ چ دەڵێیت؟

کابرای دز: گەورەم ئەمە هی خۆمە ئێستا لە دەستە خۆمی نابینیت؟

ئەیاس: ڕووی کردە کابرای شکات کار ئایا تۆ بەڵگەت هەیە؟

ئەمە هی تۆیە؟!.
کابرای شکات کار: نە خێر گەورەم.
ئەیاس: دەرگاوان ئا دەی (شانە) یەکم بۆ بهێنە.
ئینجا هەلسا بە شانە کردنی (قژی ) هەردووکیان، کاتێک قژیانی شانە ئەکرد ئەوەی جلە سەوزەکەی هەبوو ئەوە لەناو قژی تاڵە موی سەوز ئەهاتە دەرەوە، وە ئەوەی جلە سورەکەی هەبوو لە ناو قژی تالە موی سوور ئەهاتە دەرەوە، ئینجا حەقەکەی بۆ لای کابرا گەڕاندەوە.
وە هەروها بەسەرهاتی ئەم کەلە پیاوە زۆرە، جارێکیان کابرایەک هەبوو لە شاری (بەسرە) خۆی وا دائەنا کە کابرایەکی ڕاستگۆ و دەست پاکە کاتێک خەڵك پارە وسامان و ماڵیان لا دائەنا دوایی کە ئەچوون وەری بگرنەوە ئەی گوت شتی وا نیە تۆ هیچ پارەت دانەناوە لای من.
کابرایی شکات کار: گەورەم فلانە کەسی درۆزن ئەوندە پارەم لای داناوە ئێستا ئەڵێت لای من نیە.
ئەیاس: ئایا کابرای درۆزنی فێل باز ئەزانێت تۆ هاتووی بۆ لای من؟
کابرایی شکات کار: نەخێر گەورەم ئاگادار نیە.
ئەیاس: برۆ ماڵەوە بەیانی وەرەوە لام.
ئەیاس: ناردی بە دوای کابرای فێل باز و درۆزن، گوتی: ئەی کابرا پارە و ماڵێکی زۆری هەتیو وە هەژارانم لایە ئەگەر کاتت هەیە لەگەڵ جێگا، ئەوە بەیانی وەرە دوو حەمال بهێنە و پارەکە ببە.
بەیانی کابرایی شکات کار هات گوتی: گەورەم هاتووم بۆ پارەکەم.

ئەیاس: برۆ لای کابرای فێڵ باز و درۆزن بڵێ پارەکەم بدەرەوە ئەگینا ئەتبەم بۆ لای قازی .

کابرایی شکات کار هاتە لای کابرای فێڵ باز و دز، گوتی: کابرا پارەکەم بدەرەوە .

کابرایی فێڵ باز و دز: لای من نیە شتی وا نیە .

کابرایی شکات کار: ئەگەر نەم دەیتەوە ئەوا شکایەتت لە لای (قازی - دادوەر) لێ ئەکەم .

کابرایی فێڵ باز و درۆزن : باشە فەرموو ئەوە پارەکەتە و گەردنیشم ئازاد بکە .

کابرایی شکات کار: گەرایەوە لای ئەیاس، گوتی: شوکر بۆ خوا پارەکەی دامەوە خوا خێری تۆ بنووسێت .

دوایی کابرایی فێڵ باز و درۆزن هاتە لای ئەیاس، گوتی: گەورەم بۆ ئەمانەتەکان هاتووم ئەوا دوو حەمالکەشم لەگەڵە .

ئەیاس: هەی دوژمنی الله تۆ خراپترین کەسی، ئاینت کردۆتە قۆل برین و هەڵخەڵەتاندنی خەڵک .

لەگەڵ ئەوەشدا چەند زیرەک بوو، بەڵام جار هەبوو کەوا خەڵکانێک لەو زیرەکتر بن و فێلی لێ بکەن، ئەوەتا ئەگێرتەوە ئەڵێت جارێکیان کابرایەک هات تاوەکو ( شایەتی) بدات، گوتی: فڵان باخچەی کە لەم شوێنەیە هی فڵان کەسە هی فڵان کەس نیە .

ئەیاس: باشە ئەزانی چەند داری لە ناوە ئەم باخچەیە؟

کابرایی شایەت: باشە گەورەم تۆ چەند ساڵە لەم شوێنە (قازی - دادوەر) یت؟

ئەیاس: چەند ساڵێکە .

کابرایی شایەت: گوتی گەورەم ژمارەی دارەکانی ئەم سەقفە چەندە؟

ئەیاس: نازانم .

ئینجا ئەیاس شایەتیەکەی قبوڵکرد .

باوکی ئەیاس کە وەفاتی کرد تەمەنی حەفتا و شەش ساڵ بوو، شەوێکیان ئەیاس لە خەودا بینی لەگەڵ باوکی پێشبرکێان ئەکرد بە سوار چاکی نە ئەیاس ئەی بردەوە وە نە باوکی .

کە تەمەنی گەیشتە حەفتا و شەش سال شەوێکیان لەسەر جێگا پال کەوتبوو بە خێزانی خۆی گوت: ئەزانن ئەم شەوە بوو باوکم تەمەنی گەیشتە حەفتا و شەش ساڵ؟

کە بەیانی لە خەو هەلسان بینیان گیانی سپاردووە، هەزاران ڕەحمەت لە گیانت بێت ئەی (قازی - دادوەر) ی سەر ڕاستی ئوممەت ئامین.

# وێنەی دەیەم:
# موحەممەدی کوڕی سیرین

(سیرین) هەوڵی بێوەچانی خۆیدا بۆ ئەوەی نیوەی تری باوەڕی تەواو بکات کە مەبەستی ژن هێنان بوو، پاش ئەوەی هاوەڵی بەرێزی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) (ئەنەسی کوڕی مالیک) (ڕەزای الله تعالی لێبێت) (سیرین) ی ئازاد کرد ئینجا (سیرین) پاش ئەوەی ئیش و کارەکەی زۆر بەرەو پێش چوو خۆی وەستایەکی کارامەی دەست ڕەنگین بوو لە دروست کردنی مەنجەل و قاپ و قاچاخ.

پاش گەران و سوران لە دەست نیشان کردنی ئافرەتێکی چاک و خاوەن باوەڕ، ئافرەتێکی دۆزییەوە کە ناوی (سەفیە) بوو (خزمەت کار) بوو لای ماڵی خەلیفەی باوەڕداران (ئەبوبەکری سدیق) (ڕەزای الله تعالی لێبێت)، ئەم ئافرەتە تابلێی جوان و قەشەنگ و خاوەن ئاین و ئەدەب و ئەخلاق بوو، زۆر لەلای دایکی ئیمانداران خاتوو (عایشە) (ڕەزای الله تعالی لێبێت) خۆشەویست بوو، پاش ئەوەی ئەم ئافرەتەی دۆزییەوە چووە پێش بۆ داواکردنی لە خەلیفەی باوەڕداران (ئەبوبەکری سدیق) (ڕەزای الله تعالی لێبێت) خەلیفە وەک باوکێکی بەوەفا بەبەزەیی بەرامبەر کچە بچکۆلەکەی کەوتە سۆراخ وەرگرتنی کوڕەکە کە(سیرین) بوو خەلیفەی باوەڕداران ئەبوبەکر (ڕەزای الله تعالی لێبێت) پرسیاری زاوایی لە

خاوەنەکەی کرد کە هاوەڵی بەرێزی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) (ئەنەسی کوڕی مالیک) (ڕەزای الله تعالی لێبێت) بوو.

ئەنەس گوتی: ئەی خەلیفە (سیرین) کوڕێکی زۆر باشە من ئەی ناسم کاتێک کە منداڵ بوو خالیدی کوڕی وەلید (ڕەزای الله تعالی لێبێت) لە شەری (عین التەمر) لە خوار شاری کوفە بە ئەسیری هێنایی خۆی و چل منداڵی تر، وە (سیرین) بەبەر من کەوت بەڕاستی خاوەن ئەدەب و ئاینە، خەلیفە ئەبوبەکرد ڕازی بوو (سەفیە) بدات بە( سیرین) وەک باوکێکی دڵسۆز ئەم ئافرەتەی دا بە شوو و ئاهەنگێکی خۆشی بۆ سازدا کە لە شاری مەدینە کەم وێنە بوو .

لە کاتی مارەکردنی ئەم ئافرەتە لە (سیرین) هەژدە هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) کە لە شەری (بەدر) بەشداریان کردبوو ئامادە بوون، وە هاوەڵی بەرێزی پێغەمبەر (ﷺ) کە نووسەری (قورئان) بوو (ئوبەی کوری کەعب) دوعای بۆ سیرین کرد و هەر هەژدە لە هاوەڵی بەرێزی پێغەمبەر (ﷺ) کە بەشداری شەری بەدریان کردبوو گووتیان ئامین .

لەکاتی رازاندنەوەی ئافرەتەکە سێ لە دایکی باوەڕداران بە دەستی خۆیان رازاندیانەوە، لە بەروبومی ئەم ژن هێنانە پیرۆزە الله تعالی کوڕێکی پێ بەخشین ئەوییش (محمدی کوڕی سیرین) بوو، وەرن با پێکەوە باسی ئەم پیاو چاکە بکەین بزانین کێیە ئەم کەسە الله پەرستە دونیا نەویستە؟

(محمدی کوری سیرین) دوو ساڵ مابوو لە خیلافەتی (عوسمانی کوڕی عەفان) (ڕەزای الله تعالی لێبیت) لە دایک بوو لە ماڵێکی پر لە ئیمان و ئەدەب و ئەخلاق، کاتێک گەورە بوو مزگەوتی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) نزیکترین شوێن بوو لەم کوڕە گەنجە زۆر بەخت هاوەڵی بوو، چونکە هێشتا زۆرێک لە هاوەڵە بەرێزەکانی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) (ڕەزای الله تعالی یان لێبێت) لە ژیان مابوون و زۆرێک لە تابیعیە بەرێزەکان لەوانە (زەیدی کوڕی سابت و ئەنەسی کوڕی مالیک و عومرانی کوڕی حوسین و عبداللەی کوڕی عەباس و عبداللەی کوڕی عومەر و عبداللەی کوڕی زوبێر و ئەبو هوریرە ) لەسەر دەستی ئەم هاوەڵە بەرێزانەی پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) (ڕەزای الله تعالی یان لێبێت) پەروەردە بوو بە باشترین پەروەردە، زانستی شەرعی و فەرمودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەرگرت .

ئینجا ئەم گەنجە سەری خۆیان هەڵگرت بۆ شاری (بەسرە)، شاری بەسرە لە سەردەمی خەلیفەی باوەڕداران عومەرِی کوری خەتاب (ڕەزای الله تعالی لێبیت) دروست کرا بوو شاریکی پڕ پیت و بەرەکەت بوو، پێگەی سەربازی بوو بۆ موسوڵمانان .

(محمدی کوری سیرین) لە شاری بەسرە ژیانی خۆی کرد بووە دوو بەش:

**بەشی یەکەم:** بەشێکی ڕۆژەکەی بۆ وەرگرتنی زانیاری شەرعی و پەرستن و عیبادەت تەرخان کردبوو.

**بەشی دووەم:** بەشێکی دیکەی بۆ کەسابەت کردن بۆ دابین کردنی بژێوی ژیانی .

کاتێک دونیا بە نوری خوای پەروەردگار ڕووناک ئەبوویەوە ئەچوو بۆ مزگەوت خەڵکی فێر ئەکرد و خۆی فێری زانست ئەکرد، وە کاتێک ڕۆژ بەرز ئەبوویەوە ئەچوو بۆ بازار بۆ ئەوەی بژێوی ڕۆژانەی خۆی پەیدا بکات، وە هەروەها کاتێک شەو ئەهات لە ماڵەکەی خۆی قورئانی پیرۆزی لە شەونوێژدا ئەخوێند نزاو پارانەوەی ئەکرد تاوەکو دراوسێکانی بەزەییان پێ ئەهاتەوە کە چۆن وا ئەگرێت و قورئان ئەخوێنێت .

لە ڕۆژدا چۆن بەناو بازارەکاندا ئەهات و ئەچوو خەڵکی ئاگادار ئەکردەوە ئەی ترساندن بە ئاگری دۆزەخ کە نەکەن فرت و فێل بکەن لە کاتی کڕین و فرۆشتن، وە هەروەها قسەی نەستەقی زۆر خۆشی هەبوو بۆ دڵنەوایی خەڵک نەک مچ ومۆر وەک هەندێک لە خەڵکان، بەڵام بە بێ ئەوەی لە رێزی خۆی کەم بکات .

کاتێک خەڵک ئەیان بینی لەناو بازاردا نقوم ببوون لە گوناە و فێل کردن کە ئەویان ئەبینی رائەچڵەکان و زیکری خوایان ئەهاتەوە بیری.

زۆر ڕووداو هەیە کە تیایدا ئەو کەڵە پیاوە چۆن نەیهێشتووە خەڵک تیایدا تووشی گوناە ببن .

جارێکیان لە نێوان (محمدی کوڕی سیرین) و کابرایەک کێشەیەک هەبوو لەسەر دوو درهەم کە کابرا دوو درهەمەکەی کەوتبووە لای ئەو،

ئینجا ( محمدی کوڕی سیرین) سوێندی خوارد کە ئەو دوو درهەمە لای ئەوە ...

کابرا: سوێند ئەخۆیت کە لای منە .

(محمدی کوڕی سیرین): بەڵێ سوێند ئەخۆم کە ئەم دوو درهەمە لای تۆیە، سوێندی خوارد .

خەڵک سەریان سورما!

پێیان گوت ئەی (باوکی بەکر) تۆ کابرایەکی ئەوندە خێرکەری دوێنی (چل هەزار) درهەمت کردە خێر بێ ئەوەی ئاوڕێی لێبدەیتەوە بۆچی بۆ دوو درهەم سوێند ئەخۆیت !!!

(محمدی کوڕی سیرین): بەڵێ سوێند ئەخۆم، چونکە بە خوای گەورە ئەزانم ئەم دوو درهەمە حەرامە من نامەوێت حەرام دەرد خواردی ئەم کابرایە بدەم !!!

وە هەروەها مەجلیسی (محمدی کوڕی سیرین) باسی خوای گەورە و خێر و چاکە و ڕۆژی دوایی و زانستی تیادا ئەکرا .

جارێکیان دانیشتبوون کابرایەک گوتی: حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی کابرایەکی خراپ بوو وا بوو وا بوو .

(محمدی کوڕی سیرین) فەرمووی: ئەی کوڕی برای خۆم (حەجاج ) تازە مردووە چوتەوە لای خوای گەورە، وە بزانە کە ئەگەڕێتەوە لای خوای گەورە بچوک ترین گوناه لەلای تۆ لای خوای گەورە ئەوەیە کە قسەت بە (حەجاج) گوتوە زۆر گەورەیە، وە بزانە کوڕی برای خۆم خوای گەورە

کاتێك (حەجاج) ئەگەڕێتەوە لای، خوای گەورە ئەوە هەر کەسێک کەوا زوڵمی لێ کردبن خوای گەورە تۆڵەی لێ ئەسێنێتەوە، هەروەها ئەو کەسانەی کەوا زوڵمیان لە (حەجاج) کردووە خوای گەورە تۆڵیان لێ ئەسێنتەوە .

وە هەروها کاتێک ئەگەر یەکێک هاتبا بۆ لای بۆ ئەوەی بەڕێ بکەوێت بۆ بازرگانی و سەفەر ئاموژگاری ئەکردوو ئەی گوت: ئاگاداری خۆت بە گوناە نەکەی و رزقێکی(حەلال) پەیدا بکە .

جارێکیان گەورەی (بەنو ئومیە) (عومەری کوڕی هەبیرەی فیزاری) ناردی بە شوێن (محمدی کوڕی سیرین) بۆ ئەوەی سەردانی بکات کە گەیشتە لای بەخێرهاتنی کرد گوتی:

سەرکردەی ئومەویەکان: ئەی باوکی بەکر چۆن شاری بەسرات جێ هێشت؟

(محمدی کوڕی سیرین): کاتێک بەجێم هێشتن زولم و ستەم لەناویان بەر بڵاوبوو تۆش بێ ئاگابوویت گەورەم !!

کوڕی برای (محمدی کوڕی سیرین): چاوی لێ تروکاند مەبەستی ئاگاداربە وا مەڵێ .

(محمدی کوڕی سیرین): ئاوری لێ دایەوە پرسیار ناکرێت لە تۆ لە من پرسیار ئەکرێت خوای گەورە ئەفەرموێت: (نەکەن شایەتی حەق بشارنەوە هەرکەسێک بیشارێتەوە ئەوا دڵی ستەم کارە).

دوای (عومەری کوڕی هەبیرەی فیزاری) زۆر بەرێز و ئیحترام پێشوازی لێ کرد کیسەیەکی بۆ نارد سێ هەزار درهەمی تێدا بوو، بەڵام رەتی کردەوە وەریبگرێت، کوڕی برای گوتی: بۆچی وەرناگریت؟
(محمدی کوڕی سیرین): ئەو وایزانی من پیاوێکی باشم، ئەگەر من باش بم نابێت وەربگرم وە ئەگەر وا نەبێت ئەوا هەرنابێت وەریبگرم، چونکە من شایەنی ئەم دیاریە نیم !!!
بەڵام خوای گەورە ویستی وابوو سەبرو تەحەمولی (محمدی کوڕی سیرین) تاقی بکاتەوە، بۆیە جارێکیان بایی (چل هەزار) درهەم (زەیت) رۆنی شلی کڕی لە کابرایەک، بەڵام بە قیستی دواخراو، کاتێک کابرا ڕۆیشت سەری (هەمبانە) کەی کردەوە کە (زەیت) رۆنە شلەکەی تێدا بوو دیتی (مشکێکی) تۆپیوی تێدا بوو، لە دڵ و دەرونی خۆی گوتی: ئەم رۆنە هەمووی پیس بووە، ئەگەر بیگەڕێنمەوە لای کابرا ئەوا هەمووی بێ عەیب ئەفرۆشێت، هەڵسا هەمووی رژاند، ئینجا کابرا کاتی ڕۆژی دانی پارەکەی هاتبوو ئەویش هیچی نەمابوو نەپارە و نەرۆن .
بۆیە کابرا شکایەتی لێ کرد و ئەویش پارەی نیە، بۆیە کردیانە بەندیخانە، لە بەندیخانە کابرایی پاسەوان کە بینی ئەم پیاوە (محمدی کوڕی سیرین) ئەوەندە عیبادەت و الله پەرستە، دڵی پێ سوتاو گوتی:
پاسەوان: ئەی پیاوی باش بۆ ناچیتەوە کاتی شەو بۆ ماڵەوە دوایی بەیانی بێتەوە ئێمە سیقەمان بە تۆیە !
(محمدی کوڕی سیرین): نەخێر شتی وا ناکەم بە الله .

پاسەوان: بۆچی الله عافوت بکات؟؟

(محمدی کوڕی سیرین): نا تاوەکو من یارمەتیت نەدەم لە خیانەتی سەرکردەی موسوڵمانان .

کاتێک هاوەڵی بەرێزی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) (ئەنەسی کوڕی مالیک) (ڕەزای الله تعالی لێبێت) پێش ئەوەی وەفات بکات وەسیەتی کرد ئەگەر مرد ئەوا (محمدی کوڕی سیرین) بیشوات و نوێژی لەسەر بکات .

لەبەر ئەوەی (محمدی کوڕی سیرین) لە بەندیخانە بوو خەڵک هاتن بۆ لای سەرکردەی موسوڵمانان کەوا ڕێگا بدات بە (محمدی کوڕی سیرین) بێتە دەرەوە بۆ ئەوەی وەسیەتەکەی هاوەڵی بەرێزی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) (ئەنەسی کوڕی مالیک) جێبەجێ بکات، هاتن بۆ لای خەڵکەکە: فەرموو ئەی پیاوی چاک وەرە دەرەوە بۆ ئەوەی بێیت ئەم هاوەڵە بەرێزە بشۆیت و نوێژی لە سەر بکەیت .

(محمدی کوری سیرین): نەخێر من نایەمە درەوە لەم بەندیخانە تاوەکو خاوەن قەرز ڕێگا نەدات !!! خاوەن قەرزەکە هات و ڕێگای پێدا ئینجا ئەو هاتە دەرەوە . بۆیە کاتێک هات و (ئەنەسی کوڕی مالیک) ی شۆرد و نوێژی لە سەر کرد و شاردیانەوە لە گۆرستان، نەچووەماڵەوە، چونکە لەبەر ئەوەی گوتی: تەنها ئیزنم بۆ ئەوە وەرگرتوە .

(محمدی کوڕی سیرین) ژیا تاوەکو تەمەنی حەفتا و حەوت ساڵ، ئینجا ماڵئاویی لە دونیا کرد.

دەگێڕنەوە کە ئافرەتێك هەبوو بەناوی (حەفسەی کچی راشد) کە یەکێک بوو لە ئافرەتە چاکەکانی سەردەمی خۆی ئەڵێ دراوسێکمان هەبوو بە ناوی (مەروانی مەحمەلی) پیاوێکی زۆر باش و لە خوا ترس بوو وەفاتی کرد منیش زۆر دڵم خەمبار بوو شەو بینیم لە خەو پێم گوت:
(حەفسەی کچی راشد): ئەی باوکی عبداللّٰه خوای گەورە چی لەگەڵتا کرد؟ (مەروانی مەحمەلی): منی بردە بە هەشتەوە ..
(حەفسەی کچی راشد): دوایی چی تر؟؟
(مەروانی مەحمەلی): دوایی بەرزیان کردمەوە بۆ لای پێشینە چاکەکان
(حەفسەی کچی راشد): کێت بینی لەم شوێنە؟
(مەروانی مەحمەلی): حەسەنی بەسری و محمدی کوڕی سیرین.
هەزاران رەحمەت برژێ بەسەر(محمدی کوڕی سیرین) و سەرجەم ڕێبوارانی ڕێگای ئیسلام.

# وێنەی یازدە:
# ڕەجائی کوڕی حەیوە

(مەسلەمەی کوڕی عبدالملک) دەیفەرموو: (لە هۆزی کیندە، سێ پیاو هەن ئەگەر دوعا بکەن لەبەر خوای گەورە ئەوا بارانیان بۆ ئەبارێنێت و خوای گەورە بەسەر دوژمندا سەریان ئەخات، یەکێک لەوانە ڕەجائی کوری حەیوەیە)

لە سەردەمێک لە سەردەمەکانی تابیعیە بەرێزەکان سێ پیاو هەبوون، وێنەیان نەبوو لە چاکی و پاکی و خوا پەرستی وەک ئەوە وابێت لەیەک کات یەکتریان ناسیبێت، فەرمانیان بە چاکە کرد بێت و نەهیان لە خراپە کردبێت ....

وەک ئەوە وابێت پەیمانیان دابێت لە سەر کردنی خێر و چاکە ........

وەک ئەوە وابێت ژیانیان تەرخان کردبێت بۆ خزمەتی زانست و لە خوا ترسان .....

وەک ئەوە وابێت خۆیان بەخشیبێت بۆ خزمەتی ڕێبازی خوای گەورە و خزمەتی سوننەتی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) و خزمەتی خەڵکی موسوڵمان ئەم سێ کەسە بوون.....:

**یەکەم:** (محمدی کوڕی سیرین) لە وڵاتی عێراق .

**دووەم:** (قاسمی کوڕی محمدی کوڕی ئەبو بەکر) لە وڵاتی حیجاز .
**سێیەم:** (ڕەجائی کوڕی حەیوە) لە وڵاتی شام .
دەوەرن با پێکەوە چەند ساتێک لە خزمەت ئەم پیاوە اللە پەرستە بین فێری تام چێژی اللە پەرستی ببین ....
(ڕەجائی کوڕی حەیوە) لە شاری (بیسان) لە وڵاتی (فەلەستین) لە دایک بووە لە کۆتایی خیلافەتی پێشەوا (عوسمانی کوڕی عەفان ) (اللە تعالی لێی ڕازیبێت) .
(ڕەجائی کوڕی حەیوە) لە هۆزی (کیندە) عەرەبیە ....
بۆیە (ڕەجائی کوڕی حەیوە) خەڵکی وڵاتی (فەلەستینە).
بۆیە ئەم گەنجە (کیندیە) هەر لە گەنجیەوە پەروەردە بوو لە اللەپەرستی، خوای گەورەی خۆش ویست خوای گەورەش خۆشە ویستی کرد لەلای خەڵک .
ئەم گەنجە هەر لەسەردەمی لاویەتی دەستی کرد بە خوێندنی زانستی شەرعی، بینی زانستی شەرعی کلێنەی چاویەتی دڵی پێ ئەکرێتەوە بۆیە خوای گەورە پێی بەخشی.
هەر لە سەرەتادا دەستی کرد بە لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) ، بۆیە بیری خۆی ڕووناک کردەوە بە قورئانی پیرۆز بەرچاوی خۆی ڕووناک کردەوە بە فەرموودەی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) بۆیە دڵی پڕ بوو لە نوری قورئان و فەرموودەی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) تا گەیشتە ئەم پلەیەی خوای گەورە (حیکمەت_دانایی) پێ

بەخشی، وەهەر کەسێکیش دانایی پێ ببەخشرێت ئەوا خێرێکی گەورەی پێ بەخشراوە .

ئەم گەنجە زانستی شەرعی لە کۆمەلێک هاوەڵی پێغەمبەری سەروەر(ﷺ) وەرگرت (ڕەزای الله تعالی یان لێبێت) لەوانە (ئەبو سەعیدی خودری و ئەبو ئومامە و عوبادەی کوڕی سامت و موعاویەی کوڕی سوفیان و عبدالله کوڕی عەمری کوری عاس و نەواسی کوڕی سەمعان) وە زۆرێکی تر لە هاوەڵە بەرێزەکان ......

ئەمانە بوون بە ڕووناک کەرەوەی پێش چاوی ئەم گەنجە الله پەرستە ئەم گەنجە لە الله ترسە چەند شتێکی بۆ خۆی دانابوو بەردەوام ئەیانی گووتەوە .....

چەند باشە( ئیسلام) ( باوەڕ) جوان تری ئەکات ........

چەند باشە (باوەڕ) (لەخوا ترسان) جوان تری ئەکات ........

چەند باشە ( لە خوا ترسان) (زانست) جوان تری ئەکات .........

چەند باشە ( زانست ) ( کردەوە) جوان تری ئەکات ...........

چەند باشە ( کردەوە) ( نەرم ونیانی) جوان تری ئەکات ........

(رەجائی کوڕی حەیوە) کاربەدەستی کرد بۆ زۆر لە خەلیفەکانی (ئومەوی) (عبدالملک کوڕی مەروان) تاوەکو

(عومەری کوڕی عبدالعزیز) وە، بەڵام نزیک ترینیان (سلیمان کوڕی عبدالملک) و (عومەری کوڕی عبدالعزیز) بوو.

ئەم پیاو چاکە بە چی لەم (خەلیفانەی ئومەویی) نزیک ببوە لە دڵی ئەوان؟

پرس پێکردنی لە ئیش و کار .......

ڕاست گۆیی ............

دانایی لە چارەسەر کردنی هەر کێشە و گیرو گرفتێک .....

وە لە هەمووی گرنگتر نەویستنی ئەم هەموو موڵک و ماڵەی کە لە بەر دەستیان بوو، ئەگەر بیوستبایە ئەیتوانی داوای هەر شتێکی بکردبایە ئەوا بۆیان جێبەجێ ئەکرد، بەڵام دونیای نەویست بۆیە حەزی کردبایە خۆشی و ڕازاوەی دونیای بەدەست ئەهێنا .

بۆیە پەیوەندی بە (خەلیفەکانی ئومەوی) خێرێکی گەورەی بۆیان هەبوو، چونکە ئەو بۆ ئەوان ببوو بە ......

داوای لێ ئەکردن بۆ کاری (خێر) و ڕێگاشی پێ نیشان ئەدان ......

داوای لێ ئەکردن واز لە (خراپە) بهێنن دەرگاکانیشی دائەخست .....

وە شتی پرو پوچی بۆ ڕوون ئەکردنەوە و پێشی ئەگوتن نەچن بە لایدا...

وە هەقی بۆ ڕوون ئەکردنەوە ئەو کەسانەی لە سەر هەق بوون پییانی ئەناساندن ......

بۆیە ببوو بە ئامۆژگاری کەرێکی چاک بۆ الله تعالى پاشان پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) و سەرکردەی موسوڵمانان و خەڵکی بە گشتی ...

بۆیە (رەجائی کوڕی حەیوە) ڕووداوێکی زۆر سەیر و سەمەرەی بەسەر هات لەمە فێر بوو چۆن پەیوەندی لەگەڵ (خەلیفەکانی ئومەوی) دا سنوور دار ئەکات و نەهێڵێت لە خشتەی ببات..

خۆی بۆمان ئەگێڕێتەوە ئەفەرمووێ:

کاتێک ئێمە ڕاوەستا بووین لەگەڵ خەلفیە (سولیمانی کوڕی عبدالملک) لە ناو ئاپۆرای جەماوەر بینیم کابرایەک بەرەو ڕووی ئێمە ئەهات شێوەی زۆر جوان و قەشەنگ بوو زۆر بەسام و هەیبەت بوو، وە منیش زانیم کە نایەوێت خەلیفە ببینێت هاتە لای دەستە ڕاستی من و سڵاوی لێ کردم و گوتی:

ئەی (رەجاء) تۆ بە هۆی ئەم کابرایە تووشی تاقیکردنەوە بوویت.

دەستی بۆ خەلیفە درێژ کرد ....

نزیک بوونەوە لە خەلیفە یان خێرێکی گەورەت دەست ئەکەوێت یان خراپەیەکی گەورە.....

نزیک بونەوەکەت بکە بەخێر بۆ خۆت و خەڵک و خەلیفەش ......

بزانە ئەی (رەجاء) هەر کەسێک نزیک بێت لەدەسەلاتدار وە ئیش و کارێ پیاوێکی بێ توانای بەرز کردەوە لای، ئەوا کاتێک ئەگەرێتەوە لای خوای گەورە لە کاتی لێکۆڵینەوە لەگەڵیدا لە ڕۆژی دوایی قاچەکانی جێگیر ئەکات ..

وە هەروەها ئەی (رەجاء) لەیادت نەچێت هەر کەسێک پێویستی برا موسوڵمانێک جێبەجێ بکات ئەوا خوای گەورە پێویستی جێ بەجێ

ئەکات، وە لە یادت بێت خۆشەویسترین شت لەلای خوای گەورە خۆشی بکەیتە دڵی موسوڵمانێکەوە .
(ڕەجاء).. گوتی: ئینجا من چاورێ ئەو بووم زیاتر ئامۆژگاریم بکات خەلیفە هاواری کرد گوتی: کوانێ (ڕەجاء) .؟؟
پرسیاری شتێکی لێ کردم خەریک بووم وەڵامی بدەمەوە ئاوڕی لای ڕاستم دایەوە کابرا نەمابوو زۆر لەدوایی گەڕام بەڵام دیار نەمابوو.......
(ڕەجائی کوڕی حەیوە) چەند هەڵوێستێکی پیاوانەی ڕاست گۆی هەیە لەگەڵ خەلیفەکانی بەنوئومیە تا ئێستاش مێژوو باسی ئەکات و شانازیە بۆ ئەم کەڵە پیاوە لەوانە ....
جارێکیان لەلای خەلیفە (عبدالملک کوڕی مەڕوان) یەکێک باسی کابرایەکی کرد گوتی: ئەم کابرایە پیاوی (عبدالله کوڕی زوبێر)ە و پشتی ئەوی گرتووە و ڕقی لە خەلیفەی بەرێزە ......................
خەلیفە زۆر تووڕە بوو گوتی:
سوێند بەخوا ئەگەر بەردەستم ئەکەوێت..
ئەبێت واو وای لێ بکەم ...
زۆری نەبرد کابرا کەوتە دەست خەلیفە، کە بینی خەلیفە چاوی سوور ببوە خەریک بوو لە پێستی خۆی دەربچێت .
(ڕەجائی کوڕی حەیوە) گوتی: ئەی خەلیفەی باوەڕداران خوای گەورە ئاواتەکەی هێنایە دی وە ئەوەی ئارەزووت لێ بوو هێنایە دی، جا ئێستا شتێک بکە کە خوای گەورە پێ خۆش بێت لە لێ بوردەیی.

خەلیفە کە ئەم قسانەی (ڕەجائی کوڕی حەیوە) ی گوێ لێ بوو هێور بوویەوە و لە کابرا خۆش بوو دیاریشی پێدا .

لەساڵی نەود و یەکی کۆچی خەلیفە (وەلیدی کوڕی عبدالملک) ویستی سەردانی مزگەوتی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) بکات لەم گەشتەدا (ڕەجائی کوڕی حەیوە) و(عومەری کوڕی عبدالعزیز) لەگەڵدا بوون وە هەروەها ویستی گەورەی بکات، بۆیە کاتێک چووە ناو مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) ئارەزوی وابوو بە تەنها تەماشای بکات و لێ رابمێنێت، خەڵکەکەیان کردە دەرەوە تەنها یەک پیاو نەچووە دەرەوە ئەویش (سەعیدی کوڕی موسەیب) بوو پاسەوانەکان ویستیان بیکەنە دەرەوە، بەڵام ئەو نەچووە دەرەوە، (عومەری کوڕی عبدالعزیز) ئەوکاتە سەرکردەی شاری مەدینە بوو ناردی بەشوێن ئەم پیاو چاکە گوتی: برۆ دەرەوە وەک ئەم خەڵکە ئەویش گوتی: ناچمە دەرەوە تەنها ئەو کاتە کەویستم لێبێت بچمە دەرەوە، پێیان گوت باشە هەر وەرە سەلام لە خەلیفە بکە، گوتی: من هاتومە ئێرە بۆ خوای گەورە ڕابوەستم .

کە (عومەری کوڕی عبدالعزیز) زانی چ ڕوویداوە لە نێوان ئەم پیاو چاکە و نێردراوەکەی ڕێرەوی خەلیفەی وەرئەگێڕا بۆ لایەکی تر ..

(ڕەجائی کوڕی حەیوە) سەرقاڵی ئەکرد بە بەقسەی تر بۆ ئەوەی خەلیفە ئاگای لە (سەعیدی کوڕی موسەیب) نەمێت .

وەلیدی کوڕی عبدالملک: ئەم پیاوە پیرە کێیە؟

ئەمە (سەعیدی کوری موسەیب) نیە؟

(ڕەجائی کوڕی حەیوە): بەڵێ گەورەم .
(ڕەجائی کوڕی حەیوە): قوربان ئەم کابرایە پیاو چاکی ئەم زەمانەیە خواپەرستە دونیا نەویستە وایە وایە ....
قوربان گەورەم ئەگەر بیزانیبا ئەوا تۆ دێیت ئەوا ئەهاتە پێشوازیت، بەڵام ئەبینی چاوەکانی کز بووە ...
وەلیدی کوڕی عبدالملک: من باشتر ئەیناسم ئەم کابرایە لە ئێوە، با بچین بۆ لای ...
خەلیفە دوایی چوو بۆناو مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) تا گەیشتە لای ئەم پیاو چاکە ...
وەلیدی کوڕی عبدالملک: پیاوە پیرەکە چۆنی؟؟؟
سەعیدی کوری موسەیب: لەجێگای خۆی هەڵنەسا و سپاس بۆ خوای گەورە لە خێر و بەرەکەتی خوا ئەژین ..
ئەی خەلیفەی باوەڕداران چۆنە؟
باشە خوای گەورە دەست بەبالیەوە بگرێت ....
وەلیدی کوڕی عبدالملک: لێیداو ڕۆیشت لەبەردەمی خۆی ئەی گوت ئەمە میرات گری پێشینی چاکی ئەم ئومەتەیە
وە هەروەها لەگەڵ خەلیفە (سولەیمانی کوڕی عبدالملک) وێنەیەکی جوامێرانەی نواند کاتێک ئەم خەلیفەیە ئەی ویست کوڕەکانی بکات بەخەلیفە، بەڵام (ڕەجائی کوڕی حەیوە) نموونەی زانای پاک و داناو لێهاتوی ئەو بوو کە توانی خەلیفە ڕازی بکات بۆ ئەوەی (عومەری کوڕی

عبدالعزیز) بکات بە خەلیفە لەدوایی ( سولەیمان) وەرن با پێکەوە خۆی بۆمان بگێڕێتەوە ...

(رەجائی کوڕی حەیوە): ئەڵێ ئێمە لەگەڵ خەلیفە (سولەیمانی کوڕی عبدالملک) بووین لە نزیک شاری (دابق) لەشام، چونکە سووپایەکی بەرێ کرد بوو بەسەرکردایەتی برای خۆی کە ناوی (مەسەلەمەی کوڕی عبدلملک) بوو بۆ ئەوەی شاری (قوستنتینیە _ئەستنبول) رزگار بکات، لەرۆژی هەینی لەمانگی سەفەر ساڵی نەوەد و نۆی کۆچی، خەلیفە جلێکی جوانی سەوزی لەبەر کردو خۆی ڕازاندبویەوە تەمەنی نزیک چل ساڵێک ئەبوو دوایی چوو بۆ ئەوەی پێش نوێژی بۆ خەڵک بکات، بەڵام بەساغ و سەلامەتی نەگەڕایەوە بۆ ماڵ، بەڵکو نەخۆش کەوت، وە ڕۆژ بە دوایی ڕۆژ نەخۆشیەکەی گرانتر ئەبوو، ئەڵێ منیش ڕۆژیکیان چوومە ژورەوە بۆلای خەلیفە بینیم شتێک ئەنووسێت ....

(رەجائی کوڕی حەیوە): چی ئەکەی ئەی خەلیفە؟

خەلیفە: ئەزانم ئەمە دوایین وەسیەت نامەمە بۆیە نوسراوێک ئەنووسم بۆ ئەوەی کوڕەکەم (ئەیوب) لەدوای خۆم بکەم بە خەلیفە.

(رەجائی کوڕی حەیوە): گەورەم ئەوەی وا لەخەلیفە ئەکات کە خوای گەورە لێ ڕازی بێت و لە گۆڕەکەی بە سەلامەتی بێت ئەوا پیاوێکی چاک و باش لە دوای خۆی بکات بە (جێ نشین - خەلیفە)، کوڕەکەی تۆ (ئەیوب) منداڵە هێشتا بالغ نەبووە، ئینجا دوایی نازانیت باشە خراپە !!!

خەلیفە: بەڵام من خۆ تازە نووسیومە زۆر داواشم لە خوای گەورە کردووە، بەڵام ئەمە نووسراوەکە ئەدڕێنم، ئینجا دڕاندی .

دوایی پاش ڕۆژێ دوو ڕۆژ مایەوە ئینجا بانگی کردم گوتی ..

خەلیفە: باشە پێت چۆنە ( داوود) کوڕە گەورەم؟

(ڕەجائی کوڕی حەیوە): گەورەم (داوود) لێرە نیە، بەڵکو لە جەنگ و جیهادە ئینجا کێ ئەڵێ هێشتا ماوە یان مردووە؟

خەلیفە: باشە تۆ کێ ئەبینیت؟

یەک بە یەکی ئەژماردن ئینجا تا گوتی: پێت چۆنە (عومەری کوڕی عبدالعزیز)؟

(ڕەجائی کوڕی حەیوە): گەورەم پیاوێکی چاکە و ڕاست گۆیە و لێهاتوە و لە الله ترسە..

خەلیفە: بەڵێ ڕاست ئەکەیت، بەڵام ئەگەر بە تەنها ئەو بووە خەلیفە ئەو کوڕەکانی (عبدالملک) تووڕە ئەبن و نایەڵن بەردەوام بێت فیتنە و ئاشوب ئەنێنەوە ....

(ڕەجائی کوڕی حەیوە): ڕاست ئەکەیت گەورەم یەکێکیان بکە خەلیفە لە دوای (عومەر).

خەلبفە: بەناوی خوای گەورە و میهرەبان، ئەم نووسراوە لە لایەن بەندەی الله پێشەوایی باوەڕداران (سولیمانی کوڕی عبدالملک)، من لە دوای خۆم (عومەری کوڕی عبدالعزیز) م کردە خەلیفە، وە لە دوای ئەویش (یەزیدی کوری عبدالملک) ئەبێتە خەلیفە، گوێ ڕایەڵی بن و لە

اللە بترسن لە قسەی دەرنەچن، ئینجا مۆری کرد و نووسراوەکەی دا بەمن، ئینجا خەلیفە فەرمانی کرد بە بەرێوەبەری پۆلیس بۆ ئەوەی خزم و کەس وکارەکانی هەموو کۆ بکاتەوە.

کە هاتن بۆ لای خەلیفە پیانم گوت:

(رەجائی کوڕی حەیوە): پێش ئەوەی بچن بۆ لای خەلیفە ئەم نووسراوە خەلیفە خۆی نووسیویەتی ئەبێت پەیمان بدەن بەو خەلیفەی کە دای ناوە لە پاش خۆی .

خزم و کەس و کار: بەڵێ گۆی ڕایەڵین بۆ فەرمانەکانی خەلیفە ..

ئینجا کاتێک خزم و کەس وکار چوونە لای خەلیفە پێیانی گوت:

خەلیفە: ئەم نووسراوەی دەست (رەجائی کوڕی حەیوە) ئەبینن؟

ئەوا من نووسیومە ئەوا پەیمانی منی تێدایە ناوی کێ تێدا هاتبوو گوێ ڕایەڵی بن و لێی لانەدەن، ئینجا یەک لە دوای یەک پەیمانیاندا .

کەخەڵک ڕۆیشت (عومەری کوری عبدالعزیز) هاتە لام گوتی: برام خەلیفە زۆر گومانی باش بەمن ئەبات زۆرچاکەی لەگەڵ مندا کردووە، و من زۆر ئەترسم کەوا من بکاتە بە خەلیفە !!

برام توخوا ئەگەر ئەزانی ناوی منی تێدایە توخوا با بچم خەلیفە پاش گەز بکەمەوە پێش ئەوەی کار لە کار بترازێت.

من نامەوێت ببمە خەلیفە (رەجائی کوڕی حەیوە): بەخوا یەک وشەت پێ ناڵێم ...

دوایی کاتێکی کەمی برد (هیشامی کوری عبدالملک) هات و پێ گوتم:

ئەی باوکی میقدام: خۆت ئەزانیت من و تۆ لە مێژە برادەرین و من چاکەی زۆرم لەگەڵ تۆدا کردووە، پێم بڵێ ناوی کێ لەم نامەیە نوسراوە؟؟؟

ئەگەر من بم ئەوا بێ دەنگ بوو وە ئەگەر من نەبم ئەوا بۆ من نەبێت ئەوا شتێکی باش نیە خیلافەت لەدەست کوڕانی (عبدالملک) دەربچێت وە من ناوی تۆ نابەم .....

(رەجائی کوری حەیوە): قەسەم بە خوا یەک وشەت پێ ناڵێم .

(هیشامی کوری عبدالملک): ڕۆیشت بەدڵێکی شکاوە لەبەرەخۆی ئەی گوت ..... باشە ئەگەر من نەبم ئەبێت کێ بێت ببێتە خەلیفە؟؟

باشە ئەبێت خیلافەت لە دەستی ئێمە دەربهێنێت؟؟؟؟

قەسەم بە خوا من باشترین کوڕانی (عبدالملک)م .....

ئینجا (رەجائی کوڕی حەیوە) ئەڵێت: چومە ژوورەوە لای خەلیفە بینیم وا لە گیان بەخشین دایە منیش ڕووم وەرگێرا بۆ لای قیبلە دوو جار وام لێ کرد .

خەلیفە: گوتی هێشتا ماوە کاتی گیان بەخشین ماوە ..

دوجار وام لێ کرد جاری سێیەم گوتی ئێستا ئەی رەجا ئێستا ....

خەلیفە: گوتی **(اشهدان لا اله الا الله وان محمد رسول الله)** گیانی سپارد .

(رەجائی کوڕی حەیوە): بەردەوام ئەبێت و ئەڵێت ئینجا خێزانەکەی گوتی: ئەمەوێت پیاوکەم ببینم، کە چومە دەرەوە بە پاسەوانەکەم گوت:

ئەی پاسەوان خەلیفە چەند کاتێک ئەخەوێت برۆ بەخێزانەکەی بڵێ جارێک نووستوە دوای ئەتوانێت بیبینێت، دوایی دەرگاکەم بە تۆکمەیی داخست و پاسەوانێک کە جێگای سیقەم بوو دامنا لەبەر دەرگا،

گوتم: یەک مرۆڤ لە سەر ڕووی ئەم زەویە ناچێتتە لای ...

ئینجا خەڵک لە رێگادا ئەگیشتن ئەرێ توخوا پێشەوای باوەرداران چۆنە؟

سپاس بۆ خوا زۆر باشە ئێستا زۆر هێمنە و ئیتر بۆ خۆی لە ئیسراحەتدایە .

دوایی ناردم بە دوای سەرۆکی پۆلیسدا ناوی (کەعبی کوڕی حامیز) بوو فەرمان پێدا کەوا خزم و کەس و کارەکانی خەلیفە لە مزگەوتی (دابق) کۆبکاتەوە کە کۆبونەوە پیانم گوت ...

(رەجائی کوڕی حەیوە): فەرموون پەیمان بدەن بەوەی کە خەلیفە نووسیویەتی لەو نووسراوە ..

خزم و کەسوکاری خەلیفە: بۆچی دیسان پەیمان دوو بارەبکەینەوە؟ خۆ ئێمە پەیمانمانداوە ..

(رەجائی کوڕی حەیوە): ئەبێت پەیمان دووبارە بکەنەوە ئەمە فەرمانی خەلیفەیە، پەیمان بدەن بەو کەسەی کە ناوی هاتووە لەم نووسراوە.

ئینجا یەک لە دوای یەک پەیمانیان نوێ کردەوە، دوای کەبینیم هەمووی پەیمانیان دوەبارە کردەوە گوتم ...

(رەجائی کوڕی حەیوە): بەداخەوە خەلیفە کۆچی دوایی کردووە .....

(انا لله وانا اليه راجعون)، وە نووسراوەکەم بۆیان خوێندەوە کە گەیشتمە ناوی (عومەری کوڕی عبدالعزیز).

(هیشامی کوڕی عبدالملک): هاواری کرد نا بەخوا (بەیعەت_ پەیمان) ی پێ نادەین .

(رەجائی کوڕی حەیوە): زۆر باشە کەواتە منیش لەسەرت ئەدەم سەرت ئەپەڕێنم .

خۆشی بۆ خەلیفەی ئیمانداران (سلیمان کوڕی عبدالملک) کەوا خۆی کریەوە لەلای خوای گەورە وە خەڵک بەوەی (عومەری کوڕی عبدالعزیز) کرد بە خەلیفە لەپاش خۆی ......

خۆشی بۆ دەستە ڕاستی سەر ڕاست (رەجائی کوڕی حەیوە) کەوا ڕاست گۆیی دەرکەوت چۆن ئامۆژگاری خێری بۆ خەلیفە کرد .....

ڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورە لێت بێت ئەی وەزیری سەر ڕاست (رەجائی کوڕی حەیوە).

# لە کۆتایی

داواکارین لە خوای گەورە ژیانی ئەم چەند کەلە پیاوەی ئیسلام سوودی هەبێت بۆ موسوڵمانان و ببێتە هۆی پەند و ئامۆژگاری و ئیمان زیاد بوون و بەهێزی دڵەکانمان لەسەر ئیسلام و تەوحید و لاالە الاالله زیاتر بتەوبونی و خۆراگریمان لەسەر رێبازی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) و هاوەڵ و تابعین و پێشینەکانی ئیسلام.

با ئێمەش چاو لەم کەلە پیاوانە بکەین کە ئەوانیش وەکو ئێمە مرۆڤ بوون، لە خوێن و گۆشت و ئیسقان دروستکرابوون، بەڵام ئەوان خۆیان و نەفس و گیان و خۆشی دونیایان کردبوویە قوربانی دینی الله تعالى، خەمیان تەنها ئەوە بووە الله لە خۆیان ڕازی بکەن، بۆیە کە ئێمەش خۆمان پێ موسوڵمانە باچاویان لێبکەین نەکەین ڕێگەی ئەوان وون بکەین قورمان بەسەر ئەگەر بۆ الله تعالى نەژین و خۆمان تەسلیمی نەکەین. بۆیە با ئێمەش بۆ الله ژیان و مردن بکەینە تاکە ئامانجمان تاوەکو دانەبڕێن لە ڕێگایان و لەو ڕێگەیەوە بگەینە بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەت. امین.

لە دوعاکانتان بەندەی هەژار بێبەش مەکەن....... عبدالله خاکی

**مافی بلاوکردنەوەی بۆ هەموو موسڵمانانە**

**{ وَمَا تَوْفِيقِي إِلَّا بِاللَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ }**

# پـێـرســت